# کاتێک
# پەیکەری ڕۆحمان بنیات دەنێین








کاتێک
پەیکەری ڕۆحمان
بنایات دەنێین

١

محمد فەتحوڵلا گولەن




# كاتێك

# پەیكەری ڕۆحمان بنیات دەنێین



محمد فەتحوڵڵا گولەن

# پێڕستی بابەتەکان

## پێشەکی

سەرانسەری جیهانی موسڵمانان لە ماوەی ئەم سێ چوار سەدەیەی دواییدا لە بازنەی داخراوی دیلێتی و، ژێردەستەیی و، نەزانی و، هەژاری و، دووبەرەکی و، دوژمنایەتی و، دواکەوتوویی و، کۆنەپەرستی و، چەقبەستووییدا گینگڵ دەخوات. لەبری ئەو ئامانجە باڵایانەی کە قورئان بۆ موسڵمانانی دارِشتووە -وەك: ئاوەدانکردنەوەی زەوی و، رِێنموونیکردنی خەڵکی بۆ چاکە و وریاکردنەوەیان لە خراپە و، گرنگیدان بە یاسا سروشتییەکان بەئەندازەی گوێرِایەڵیکردن بۆ فەرمانە شەرعییەکان و، رِوانینی گشتگیر بۆ بەدیهێنەر و گەردوون و ژیان و مرۆڤ و دانەبرِینیان لەیەکتری و، بڵاوکردنەوەی ئاشتی و ئاسایش لەسەر رِووی زەویدا و، پێشکەوتنی ماددی و مەعنەوی و، رِێزگرتن لە بەها مرۆیی و گەردوونییەکان و، گرنگیدان بە بیروباوەرِ و بیرکردنەوەی ئازاد و، هاندانی زانست و زانستخوازان و، خۆشویستنی نیشتمان...- ئێستا لە کەمەندی بەرژەوەندیخوازی و هەلپەرستیدا گیری خواردووە و، بووە بە داوی هەوا و ئارەزووەکانەوە. تەڵەی چێژی پاڵدانەوە، حەزی

کارکردن و هەوڵدانی ئەویان پێوەندکردووە و، زنجیری دواکەوتوویی و چاولێکەریی مەیلی تازەگەری و نوێبوونەوەیان لەودا یەخسیرکردووە و، پشتکردنیش لە ڕابردووی خۆی و پاڵنەرە مێژووییەکانی، بوون بە هۆکاری ئەوەی یەك لەسەر یەك زللەی تەمێکردن بخوات.

گرنگترین هۆکارەکانی ئەم دواکەوتنە -سەرەڕای ئەوانەی کە لە سەرەوە ئاماژەیان پێدرا- بریتین لە نەمانی ئامانجێکی باڵا لەسەر ئاستی ژیانی کەسی و کۆمەڵایەتیی موسڵمانان. لەحاڵێکدا موسڵمانانی پێشین خولیای مەزن و خەونی تاقانەیان بریتیبوو لە گەیاندنی حەقیقەتی ئیسلام بە دڵە تینووەکانی هەر چوارلای زەوی و، ناساندنی ناوازەترین کەسایەتیی مێژوو -کە پێغەمبەرەکەیانە- بە نەتەوە جۆراوجۆرەکانی مرۆڤایەتی و، بانگهێشتکردنیان بۆ ڕێگای ڕزگاری. هەربۆیە ڕوویان لە هەر جێگایەك دەکرد، خەڵکی پێشوازییان لێدەکردن و بە حەسرەتەوە باوەشیان بۆ دەکردنەوە. هۆکاری دووهەمیش بریتییە لە پارچەپارچەکردنی حەقیقەتێك لەلایەن موسڵمانانەوە کە شایانی پارچەپارچەبوون نییە. بەڵێ، بەپێچەوانەی موسڵمانە یەکەمینەکان، موسڵمانانی سەردەم نەیانتوانی پارێزگاری لە یەکپارچەیی حەقیقەت بکەن و، سەرکەوتوو نەبوون لە سازکردنی هاوسەنگی لەنێوان ڕووە جیاوازەکانی ئەم حەقیقەتەدا کە بریتین لە بەدیهێنەر و، گەردوون و، ژیان و، مرۆڤ. لەئەنجامدا قورئان کە گوفتاری خوایە دابڕێنرا لە گەردوون کە کرداری خوایە. موسڵمان کەوتە شیوێك و قورئانیش کەوتە دانەیەکی تر. ئەو یاسا سروشتییانەی کە بەدیهێنەر لە گەردوون و، ژیانی کۆمەڵایەتی و، مێژووی نەتەوەکاندا دایمەزراندوون و، چەندین دانایی مەزنیان لەسەر بنیاتنراوە، موسڵمانان

بە نەبوو لەقەڵەمیان دان، یاخود بە لایەنی کەمەوە بێناگا لێیان ژیانیان بەسەربرد.

بەڵێ، بێگومان هەر ئەم هۆکارانە و هاوشێوەکانیان بوون کە ئەم جیهانە پیرۆزەیان بەم ڕۆژە گەیاند. ئەم جیهانەی کە سەردەمانێك لە سایەی ئایینە دەوڵەمەندەکەی و، پێغەمبەرە میهرەبانەکەی و، کلتوورە فراوانەکەی و، زانایان و ڕۆشنبیرانی ناوی، نموونەی باڵای شارستانێتی و، پێشکەوتن و، بەها مرۆییەکان و، ژینگەیەکی ناوازە بوو بۆ پێکەوەژیانی چەندەها نەتەوە و ئایینی جیاواز.

وەك وەڵامێك لەبەرامبەر ئەم گۆڕانە نەخوازراو و ئەم دۆڕانە یەك لەسەر یەکانە، بەگشتی دوو جۆر پەرچەکردار نوێنران. دەستەیەك ڕۆژئاوایان بە سەرچاوەی هەموو خراپکارییەکان دانا و، سەرجەم تاوانەکانیان لە ئەستۆی ئەو نا و، لەئەنجامیشدا پشتیان لە هەموو ئەو شتانە کرد کە مۆرکێکی ئەویان پێوەبێت و، کەوتنە باوەشی دەمارگیرییەکی واوە کە زانست و زانیاری و تەکنەلۆجیایان بە خراپە وەسفکرد و، لە تۆڵەی ئەم بڕیارە هەڵەیەشیاندا شەپۆلی سروشتی ژیان لەگەڵ خۆی ڕایماڵین و ناویان لە مێژوودا سڕایەوە. دەستەی دووهەمیان بەپێچەوانەوە، نکووڵییان لە خۆیان و، ڕابردووی خۆیان و، ئایین و کلتور و جیهانبینیی خۆیان کرد و، خۆیان داماڵی لە هەموو پێوەر و بەها خۆماڵییەکان و، ڕزگاربوونیان لە بەڕۆژئاواییبوون و، نامۆبوون و، لاساییکردنەوەی کوێرانەدا دییەوە. ئەمانیش مێژوو کردنی بە پەندی زەمانە. چونکە هەم کەسایەتیی خۆیان دۆڕاند، هەم نەگەیشتن بە ئامانج و ناسنامەیەکی تریان چنگ نەکەوت. شارستانێتی و کلتوور پۆشاکێکی سادە نییە لەبەری ئەم نەتەوە

دابڕێنرێت و بکرێتە بەری ئەو نەتەوە. شارستانێتی پێویستی بە ئازار و، ڕەنج و، کار و، شەونخونی و خەبات هەیە. لەئەنجامدا درەختی هەردوو تاقمەکە تەنها یەك میوەی هاوبەشی گرت: "ئائومێدی!"

بەڵێ، نائومێدی کوشندەترین نەخۆشییە و دواین بەڵایە بەسەر مرۆڤ و کۆمەڵگای ئادەمیدا بێت. بەڵام خوای گەورە لە ئەزەلەوە بڕیاریداوە کە ئەم نوورە تاسەر بەردەوام دەبێت. تاریکستانی بێهیوایی هەرچەندەش دەیجوور بێت، ناتوانێت ڕووناکی درەخشان و پرشنگدار بشارێتەوە! هەربۆیە کەسانێك دەرکەوتن کە بە خۆیان و مەشخەڵی هیوا و چرای ئومێدی دەستیانەوە ڕێیان بۆ خەڵکی ڕۆشنکردەوە و، ورەیان خستەوە بەر ملی لار و ئەژنۆی ماندوویان.

خوێنەری بەڕێز! ئەم کتێبەی بەردەستت دانراوی مامۆستا فەتحوڵڵا گولەنە و لە ساڵانی حەفتاکان و هەشتاکانی سەدەی ڕابردوودا لە گۆڤاری "هیوای نوێ"دا لە شێوەی چەند وتارێکدا بڵاوی کردوونەتەوە. هەرچەندە لەماوەیەکی دووورودرێژدا نووسراون، بەڵام لەنێو خۆیاندا دارای سیستەمێکی یەکتر تەواوکەرن و، وەك زنجیرەباسێك وان کە وەسفکردنی دۆخی نالەباری ئێستای جیهانی موسڵمانان و، دەستنیشانکردنی هۆکارەکانی دواکەوتنی و، بێدارکردنەوەی هیوا و ئومێدی چارەسەر و، پیشاندانی ڕێگاکانی سەربەرزی بە نەوەی نوێ، لەخۆ دەگرن.

نووسەر لەم کتێبەدا چەشنی پزیشکێکی کارامە و لێهاتوو دەست دەخاتە سەر زامە کەسی و، خێزانی و کۆمەڵایەتی و، ماددی و مەعنەوییەکانمان و، جەخت لەسەر پێویستیی بەخۆداچوونەوە و

ڕەخنەلەخۆگرتن دەکاتەوە و، بانگمان دەکات بۆ زیندووبوونەوەی دوای مەرگ و، زایەڵەی هیوا و ئومێد دەگەیەنێت بە ویژدانمان و، هەمان ئەو دینەمۆ و بنچینانەمان یاددەخاتەوە کە بەهۆیانەوە لە ڕابردوودا توانیومانە نەك هەر سەربەرزانە بژین، بەڵکو مرۆڤایەتیش بحەسێنینەوە و زەوی بکەین بە گۆشەیەك لە گۆشەکانی بەهەشت.

دانەر بە وتاری "دنیای ناو منداڵدان" دەستپێدەکات و، پێماندەڵێت کە مێژوو هەمیشە بە نموونە لەیەکچووەکانی خۆی دووبارە دەکاتەوە و، هەنووکە دنیایەك و پێکهاتنێکی نوێ لە منداڵدانی ڕۆژگاردایە و چاوەڕێی وادەی زاین دەکات. پاشان لە "میراتگرانی زەوی"دا باسی ئەو تایبەتمەندییانە دەکات کە لە ئیماندارانی پێشوودا هەبوون و، ئاماژە بەو دینەمۆیانە دەکات کە پێویستە میراتگرانی ئەمڕۆیش لە خۆیاندا بەدیبهێنن. ئنجا لە "کاتێك پەیکەری ڕۆحمان بنیات دەنێین"دا وەکو وەستایەکی دەستڕەنگین سەرجەم ئەو کەلوپەل و پێداویستییانەمان بۆ ڕیزدەکات کە لە سەرلەنوێ بنیاتنانەوەی پەیکەری ڕۆحماندا موحتاجیان دەبین. لە وتاری "شورا"دا ئاماژە بە گرنگیی ئەم بابەتە دەکات و تیشك دەخاتە سەر سوودە زۆر و زەبەندەکانی و جێبەجێکردنەکانی لە مێژووی موسڵماناندا. پاشان لە "بیر و بزاوتن"دا پەنجە بۆ کەموکورتیی توانای بیرکردنەوە ڕادەکێشێت لەنێو موسڵماناندا و هەروەها جەخت لەسەر پێویستی بزاوتن و کارکردن دەکاتەوە. لە "مەردی بیر و بزاوتن"دا نموونەی چەندین کەسایەتی دەهێنێتەوە کە لە مەیدانی بیر و لە زەمینەی بزاوتندا قۆڵیان لێ هەڵکردووە و ئەسپی خۆیان تاوداوە. لەم ڕووەوە بە دووروودرێژی لەسەر کەسایەتی و بەرهەم و جیهانبینیی زانای پایەبەرزی کورد

"بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی" دەوەستێت و، وەك مۆدێلێك دەیخاتە پێش چاوی موسڵمانانی ئەم سەردەمە و، هانیان دەدات لە فیکر و بۆچوونەکانی تێبگەن. لە وتاری "تا جێگایەك جەبرییەت"دا نووسەر وەکو مێژووزانێکی بلیمەت تاوتوێی هۆکارەکانی سەرکەوتن و ژێرکەوتن و لەناوچوونی نەتەوە پێشینەکان دەکات و، ژێردەستەیی و دیلێتی ئێستامان وەك ئەنجامێك، دەبەستێتەوە بە هۆکاری ئەو تاوانانەوە کە لە ڕابردووی نزیکماندا دەرهەق بە خۆمان و بەهاکانمان و ئایینەکەمان ئەنجاممان داون و، لەم ڕووەوە پەنجە بۆ ئەو یاسا خواییانە درێژدەکات کە لە ژیانی کۆمەڵایەتیی نەتەوەکاندا بەرقەرارن. لە "نەوە نموونەییەکان" و "نەوەکانی هیوا"شدا خەسڵەتی ئەو نەوە نوێکار و لێبڕاوانەمان وەك تابلۆیەك بۆ دەکێشێت کە بڕیارە لە شیوە قووڵەکانی دواکەوتوویی و نەزانییەوە بەرەو لوتکە بەرزەکانی شارستانێتی و پێشکەوتن بمانگوازنەوە. لەکۆتاییشدا و لە وتاری "کاتێك ڕوو لە خۆمان دەکەین"دا ڕابردووی پرشنگداری خۆمان یاددەخاتەوە و پێمان دەڵێت ''ئەستەم نییە بگەینەوە بە هەمان ئەو ئاستە درەخشانەی جارانمان بەمەرجێك ڕاستگۆ بین لەگەڵ کەسایەتیی بنچینەیی خۆماندا و وەفادار بین بەرامبەر بەو بناغانەی کە مێژووی ئێمەی بەپێوە ڕاگرتبوو.''

لەم بەرهەمەدا نووسەر لە زۆر شوێندا باس لە ئوممەت و ڕۆحی ئوممەت، میللەت و بەها و کلتووری میللی، ئوممەت و زیندووبوونەوەی ئوممەت دەکات. جێی خۆیەتی ئاماژە بەو خاڵە بکەین کە دانەر لە ڕوانگەیەکی قورئانییەوە لەم بابەتە و گشت بابەتەکانی تریش دەڕوانێت و، سەرجەم ڕاڤە و لێکدانەوەکانیشی بەم ئاڕاستەیەدان. ئەگینا هەرگیز

مەبەست لێی ئەو چەمکە تەسکەی "نەتەوە" نییە کە پاش سەرهەڵدانی مۆدێرنیتە لە جیهاندا دەرکەوت و، تەنها ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە لە جێگایەکی دیاریکراودا بە زمانێك قسە دەکەن و ڕابردوو و بەرژەوەندییەکی هاوبەش کۆیکردوونەتەوە. بەڵکو ئامانج لێی چەمکە قورئانییەکانی وەك "ئوممەت" و "میللەت"ە و مانایەکی زۆر فراوانتری لەخۆگرتووە.

سەبارەت بە وەرگێڕانی ئەم بەرهەمەش بۆ زمانی شیرینی کوردی، هیواداریین توانیبێتمان -ئەگەر تا ئەندازەیەکیش بێت- مەبەست و نییەتی دانەر بۆ خوێنەرانی کوردزمان بگوازینەوە و، ئاشنایان بکەین بە جیهانێکی نوێ و، سەرکەوتوو بووبین لە دەربڕینی ئەو ئازار و، خەم و، دڵسۆزی و، خۆشەویستی و، فیداکارییەی کە لە هەریەکێك لە دێڕەکان و لە خامە بەپێزەکەی ئەم مامۆستا بەڕێزەوە دەچۆڕێت.

# دنیای ناو منداڵدان

سەرتاسەری جیهانی ئیسلامی لە ڕابردوویەکی نزیکیدا و لەسەر ئاستی باوەڕ و ئەخلاق و سیستەمی بیرکردنەوە و پەروەردە و پیشەسازی و عادەت و دابونەریت و بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتی، یەکێك لە سەردەمە هەرە قەیرانأوییەکانی خۆی بەسەربرد.

ئەو موسڵمانانەی سەردەمانێك لە دیندارترینەکان بەدینتر و، لەڕووی ڕەوشتەوە تابڵێی ڕێك و، عادەت و دابونەریتەکانی پتەو و دامەزراو و، بەو ئاسۆ سیاسی و کۆمەڵاتییەی خاوەنی بوون پاڵێوراوی بەڕێوەبردنی دنیا و، لە ڕوانگەی سیستەمی بیرکردنەوەشیانەوە لە هەموو خەڵکانێکی تر پێشکەوتووتر دەبینران، بەڵێ، ئەم موسڵمانانە، لە سایەی ئەخلاقی کامڵ و بیرکردنەوەی زانستی و ڕەنگدانەوەی ئایینەکەیان بێ کەموکورتی لە ژیانیاندا و، هەمیشە پێشکەوتنی ئەو سەردەمەی کە تیایدا ژیاون و، بەیارمەتی سوود وەرگرتن لە بەهرەکانی وەك ئیلهام و ژیری و ئەزموون، لە بازنەیەکی فراوانی هەر لە "پیرەنێ"[1]کانەوە هەتا ئۆقیانووسی هیندی،

١. زنجیرەچیایەکە باکووری ئیسپانیا و باشووری فەرەنسا لەیەکتر جیادەکاتەوە.

هەر لە "قازان"[١]ەوە هەتا سۆماڵ، هەر لە "پوڤاتیا"[٢]ەوە هەتا بەریەستی چین، بەشێوەیەك سەرکەوتوو بوون لە بەڕێوەبردنیدا کە ژێرییەکانی دووچاری سەرسامی دەکرد. لەکاتێکدا کە دنیا لە چاخە هەرە تاریکەکانی خۆیدا دەژیا، سیستەمێکی وایان بەخشی بەو نەتەوانەی کە لە سنووری کارگێڕی و لەژێر فەرمانڕەوایی ئەواندا بوون، وەك بڵێی یوتۆپیای[٣] نێو خەیاڵەکان بووە بە ڕاستی و جیهانیان کرد بە گۆشەیەکی بەهەشت.

ئەوەی تاڵە و جێگای داخە ئەوەیە کە هەمان ئەم دنیایە، کاتێك لەو دینامیکە مێژووییانە دوورکەوتەوە کە بەپێوە ڕایاندەگرت و بەها ئیسلامییەکانی لەدەستدا و بوو بە دیلی نەزانی و بەدڕەوشتی و ئەفسانە و چێژە ماددی و جەستەییەکان، دەستبەجێ بەرەو کەندەڵانەکانی تاریکی و دۆڕان تلێر بووەوە و دووچاری چەندین ڕووخانی یەك لەدوای یەك هات.. وەك دانەکانی تەزبیحێکی بچڕاو، چەشنی لاپەڕەکانی کتێبێك کە شیرازەی تێکچووە، کەوتە بەر پێیان.. کێبەرکێ بێسوود و نەزۆکەکان لەرزاندوویانە و پشتی بە هەزار و یەك دووبەرەکی چەمیوەتەوە.. هێندە سەرسامە، کاتێك کە لەژێر شەرم ئاوەرترین دیلێتیدا دەناڵێنێت، گۆرانی سەربەستی دەچڕێت.. بێ ناسنامەیە، وەلێ خۆپەرست. بەناوی "تابۆ"[٤]وە لە خوا و پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) یاخی بووە، بەڵام گیرۆدەی چنگی چەندەها تابۆی دی بووە و حاڵی زۆر لە هی پەرێشانەکان پەرێشانترە.

---

١. پایتەختی تەتارستانی ئێستایە.

٢. شارێکە لە فەرەنسا.

٣. یوتۆپیا "Utopia" وشەیەکی یۆنانی کۆنە بە واتای شار یان کۆمەڵگای کامڵ و خەیاڵی و نموونەیی دێت.

٤. تابۆ "Taboo" وشەیەکی فەرەنسییە بە مانای پیرۆزی و قەدەغەکراوە کۆمەڵایەتی یان ئاینییەکان دێت.

ئەوەندە هەیە سەرەڕای هەموو هەوڵەکانی چەتە و داگیرکەرانی دەرەکی و حەرامزادە ناوخۆییەکان، ئەم دواین سەردەمی تاریکییەش تەمەنی زۆر درێژ نەبووە. ئەمڕۆ موسڵمانان کە پێنج یەکی مرۆڤایەتی پێکدەهێنن، لە هەموو جێگایەکدا هەوڵی زیندووبوونەوە دەدەن و تێدەکۆشن لەم چاخی دیلێتییە نەفرەتییە ڕزگارببن. بەتایبەت لەم ساڵانەی دواییدا ئەوەی کە هەموو بەیانییەك لەگەڵ چاو کردنەوەماندا موسیبەتێکیان بینیوە و هەموو ئێوارەیەك ڕووبەڕووی چەندین مەینەتی بوونەتەوە، ئەمە بووە بە هۆکاری هاندەر بۆ هێزی مێتافیزیکی لەواندا و ڕووکردنەوە خوای گەورەی خێراتر کردووە و ئەسپی هەوڵ و خەباتیانی تاوداوە.

خۆی لە خۆیدا ئێمە لە سایەی گونجانی ڕۆحی ئیسلام لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا و پشتگیری کردنی ئەم دینە بۆ پێشکەوتنە ماددی و مەعنەوییەکانی مرۆڤ و ئەو هاوسەنگییە بێوێنەیەش کە ئایینە مەزنەکەمان لەنێوان دنیا و عوقبادا دایمەزراندووە، وای لێکردووین تەنانەت لە تاریکترین کاتەکانیشدا بە "اَلْحَقُّ يَعْلُو وَلَا يُعْلى عَلَيْه"[1] هەناسە بدەین و لەگەڵ "وَالْعاقِبَهُ لِلْمُتَّقِين"دا چاو هەڵبهێنین و دایبخەین، بەڵام هەرگیز دووچاری نائومێدی و بێورەیی نەبووین. ئەمە لە حاڵێکدا کە هەر لە ئێستاوە و بە خێراییەکی سەرسووڕهێنەر ڕووکردنە ئیسلام لە هەموو چین و توێژەکاندا دەبینرێت و هەر لە ئەمریکاوە هەتا پێدەشتەکانی ئاسیا، هەر لە وڵاتانی ئەسکەندەناڤیاوە هەتا ئوستورالیا و لە مەیدانێکی زۆر فراواندا بەرەوپێشچوونی ئیسلام بەدیدەکرێت.

سەرەڕای ئەو هەموو هەوڵ و چالاکییە سەرسووڕهێنەرانەی کە

---

١. البخاري، جنائز ٧٩؛ الطبراني، المجمع الأوسط ١٢٨/٦.

دامودەزگا تەبشیرییەکانی مەزهەبە جیاوازەکانی مەسیحییەت دەیدەن، هێشتا ئەو سەرنجڕاکێشییەی کە بۆ کەنیسە دەستەبەر کراوە، ناگات بە یەك لەسەر دەی ئەو گەرموگوڕییەی کە مرۆڤایەتی بەرامبەر بە موسڵمانێتی هەیەتی. ئەمڕۆ لە کیشوەرە جیاوازەکانی سەرزەویدا، هەموو ساڵێك بەنزیکەیی سەدان هەزار کەس سەرەڕای ئەوەی دەزانن مەحکومی برسێتی و نەبوونی دەکرێن، موسڵمانێتی هەڵدەبژێرن و پەنا بۆ نووری قورئان دەبەن.

ئومێدمان وایە کە -بێگومان ئەگەر پەیوەندیی وەفا لەگەڵ خوای گەورەدا نەبچڕێنین- لە داهاتوویەکی زۆر نزیکدا، ناوەرۆکی سوورەتی (النصر) بە هەموو شان و شکۆیەکییەوە جارێکی تریش خۆی نمایان دەکات.. وە لە ئەمریکاوە هەتا ئوستورالیا، لە بەڵقانەکانەوە تا بەربەستی چین، لە ئەوروپاوە هەتا ناوجەرگەی ئەفریقا و هەموو جێگایەکی تر، لەژێر چەتری ئیسلامدا ئیمان و ئومێد و ئاشتی و بەم هۆیەشەوە ئاسایش و ئارامی جارێکی تریش ئاڵاکەی دەشەکێتەوە.. وە پێنج ملیار کەس لە مرۆڤایەتی ئاشنای سیستەم و بەڕێوبردنێکی تەواو نوێ دەبن کە چەندین جار لە سەروو ئاستی خەیاڵەوەیە و بە بێگومانی زۆربەی خەڵکی، بە ئەندازەی سروشت و دنیای هزریی خۆی سوود لەم شەماڵە نوێیە وەردەگرێت.

# میراتگرانی زەوی

دنیا دوای خولانەوە و ئاڵوگۆڕێکی زۆر سەرەنجام بەرەو خولگەی بنەڕەتیی خۆی دەخزێت.. بەڵام داخۆ میراتگرانی ڕاستەقینەی زەوی ئامادەن بۆ وەرگرتنەوە و دەستخستنەوەی ئەو میراتەی کە لەدەستیان چووە و کەسانی تر زەوتیان کردووە؟ ئەو مافەی بەهۆی جێبەجێکردن و نوێنەرایەتی کردنەوە بەدەست دێت جیاوازە لە مافی یەکەم جار. ئەگەر حەق لە چوارچێوەی بەهاکانی خۆیدا نوێنەرایەتی نەکرێت، هەرچەندە سەرەتا درابێت بە ئوممەت و کۆمەڵێک، بەڵام هەموو ساتێک دەگونجێت لێی بسەنرێتەوە.. لێی دەسەنرێتەوە و تا ئەو کاتەی نوێنەرە ڕاستەقینەکانی پێدەگەن، لەناو ئەوانەدا دێت و دەچێت کە بە شێوەیەکی ڕێژەیی باشترن لەچاو ئەوانی تردا.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

﴿ وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِن بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ ﴾ (الأنبياء: ١٠٥)

"سوێند بە خوا بە ڕاستی ئێمە لە کتێبی زەبووردا دوای تەورات بڕیارمان داوە

کە بێگومان بەندە شیاو و چاکەکانم دەبنە خاوەنی زەوی."

پێویستە کەس گومانی لەوەدا نەبێت ئەم ڕاستییەی کە لە ڕێگەی سوێندەوە خراوەتە ژێر دڵنیاییەوە، ڕۆژێك دێت کە دێتەدی. لە هەمان کاتدا ئەم میراتگرییە تەنها لە گۆی زەویدا کورت نابێتەوە.. چونکە ئەو کەسەی میراتگر و فەرمانڕەوای گۆی زەوی بێت، باڵادەست دەبێت بەسەر بۆشایی و قووڵاییەکانی ئاسمانیشدا. کەواتە دەتوانین ئەمە بە فەرمانڕەوایەتیی گەردوونیش ناوزەد بکەین. بێگومان مادەم فەرمانڕەوایەتییەکی لەم جۆرە لە شێوازی بریکاری و جێنشینیدا دەبێت، هەبوون و دەستخستنی ئەو سیفەتانەی کە خاوەنی ڕاستەقینەی ئاسمانەکان و زەوی وەکو مەرجێك بۆ ئەم میراتگرییە دایناوە زۆر گرنگە. تەنانەت دەتوانرێت بوترێت کە بە ئەندازەی دەستخستن و پەیڕەوکردنی ئەم وەسفانە، ئەو خەونە دێتەدی.

بەڵێ، ئەگەر لە سەردەمێکی مێژوویی پڕ لە تەم و دوکەڵدا، ئەوانەی کە بانگەشەی میراتگرێتیی ڕاستەقینەی زەوی دەکەن، لەبەرئەوەی ئەو توانا و لێهاتنەیان نیشان نەداوە کە پێویستە بۆ ئەم میراتگرییە ئاسمانییە و لەلایەن خاوەنی ڕاستەقینەی موڵکەوە لەو میراتە بێبەش کرابێتن، ئەوا دیسان ڕزگاربوون لەم بێبەشبوونە، تەنها بە گەڕانەوە و هانا بردن بۆ لای ئەو دەبێت.

خوای گەورە پەیمانی داوە میراتی زەوی لەناو بەندەکانیدا تەنها بە چاکەکاران ببەخشێت، نەك بەم و بەو.. واتە بە ئەوانەی کە نوێنەرایەتیی

ڕۆحی محەممەدی و ئەخلاقی قورئانی دەکەن.. بە ئەوانەی کە لە هەستان و دانیشتنیاندا بیریان لای یەکێتی و یەکڕیزییە.. بەوانەی ئەو سەردەمە دەناسن کە تیایدا دەژین.. بەوانەی کە بە زانست و هونەر پڕچەك بوون.. بەوانەی کە هەمیشە بە سەرکەوتوویی هاوسەنگیی نێوان دنیا و عوقبایان دروست کردووە.. بەپوختی، پەیمان دراوە ئەم میراتگرێتییە بەو پاڵەوانانەی ڕۆح و مانا بدرێت کە بە هەمان ئاڕاستەی ئەو هاوەڵە پیرۆزانەدا دەڕۆن کە وەك ئەستێرەی ئاسمانی پێغەمبەرایەتی وان. ئەمەش یاسایەکی خواییە. بەگوێرەی دەستووری:

﴿ فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلًاۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحۡوِيلًا ﴾ (فاطر: ٤٣)

"ئیتر تۆ نابینیت هەرگیز لە یاسا و بەرنامەکانی خوادا گۆڕانکاری پێش بێت، هەرگیز نابینیت یاسا و بەرنامەکانی خوا لە نەخشەی خۆیان لابدەن."

هەرگیز ناگۆڕێت و "شەریعەتێکی سروشتی"ی وایە کە گۆڕانی بەسەردا نایەت.

لەم ڕووەوە بۆ بوون بە میراتگری زەوی، سەرەتا پێویست بە شایستەیی دەکات، واتە هەوڵدان بۆ ژیان لە سنووری قورئان و سوننەتدا و کردنی ئیسلام بە ژیانی ژیان. پاشان مەرجە هەڵگری میراتی زانست و هونەری سەردەم بین. پێویستە ئەم بابەتە هەرگیز لەیاد نەکرێت: ئەو کۆمەڵگایانەی چاودێری و گوێڕایەڵی ئەو "شەریعەتی سروشتی"یەی کە جێگای درەوشانەوەی توانست و ئیرادەیە لە گەردووندا و هەروەها کۆی ئەو فەرمانە خواییانەی کە لە سیفەتی گوفتارەوە سەرچاوەیان گرتووە ناکەن، یان ئەو نەتەوانەی کە لەسەر ئاستی ژیانی مەعنەوییان

دووچاری گۆڕانکاریی ناوەکی هاتوون، ئەگەر ئەمڕۆش فەرمانڕەوابن، بێگومان سبەی ژێردەستەن. ئەو مێژووەی کە بە گۆڕستانی ئوممەت لەناوچووەکان دادەنرێت، پڕ بە دەم هاواری ئەم ڕاستییە دەکات. هەروەها ئایەتی پیرۆزی:

﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّرًا نِّعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَىٰ قَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ ۙ وَأَنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾

(الأنفال: ٥٣)

"ئەو سزا و لەناوبردنە لەبەر ئەوەیە کە (بڕیاری خوا وایە) بێگومان خوا هیچ نازونیعمەتێکی نەگۆڕیوە کە بەخشیبێتی بەهەر قەوم و گەلێك، هەتا ئەوان ئەوەی بەخۆیان دەکرێت نەیگۆڕن و نەیکەن، چونکە بەڕاستیش خوای گەورە بیسەری (گوفتارەکانە) زانایە بەکردارەکان."

بنچینەیەکی گرنگمان دەربارەی فەرمانڕەوایی و ژێردەستەیی، سەربەرزی و سەرشۆڕی یاد دەخاتەوە و پەنجە بۆ بۆشاییەکی زۆر گرنگی موسڵمانانی ئەم سەردەمە درێژ دەکات.

ئەم بۆشاییە دەتوانین کورت بکەینەوە لەوەدا کە سەرجەم موسڵمانانی جیهان بنیاتی ناوەکی و ژیانی دڵ و ڕۆحیان گۆڕانێکی ناسروشتی بەسەردا هاتووە و دیوی دەرەوەشیان هەتا بڵێی دواکەوتووە لەو سەردەمەی تێیدا دەژین. ئەم گۆڕانە ناسروشتییە یان ئەم دواکەوتنە لە سەردەم، ئەگەر لەو بەربەستە یەك لەدوای یەکانەوە سەرچاوە بگرێت کە لە جیهانی دەرەکییەوە خراونەتە بەردەممان، یان هۆکارەکەی نەزانی و

لاوازی و لێنەهاتوویی خۆمان بێت، هیچ جیاوازییەکی نییە. ئەوەی ڕوون و ئاشکرایە ئەوەیە کە لەم سەدانەی دواییدا نەتەوەی ئیسلام بەبەردەوامی خوێنی لێ دەڕوات و خەمسارد و بێباکە بەرامبەر بەو سەرچاوەی هێزانەی کە بەدرێژایی چەندین سەدە ئەویان بەپێوە ڕاگرت و کردبوویان بە میراتگری ڕاستەقینەی زەوی.

تکا دەکەم، ئەوانەی کە بە ناوی ئوممەتەکەمانەوە و لە سەردەمێکی پڕ لە بەدبەختیدا بانگەشەی نوێنەرایەتیکردنی موسڵمانێتییان کردووە، داخۆ دەتوانرێت بوترێت خاوەنی ژیانێکی قووڵی دڵ و ڕۆحی وا بوون کە شایستەی یەکەمینەکان بێت؟ یان ئایا لە هەمان سەردەمدا دەکرێت باس لە هەبوونی کەسانێك بکرێت کە وەك هاوەڵە پیرۆزەکان دەستیان لە ئارەزووی ژیان هەڵگرتبێت و هاوڕێ لەگەڵ بیرۆکەی ژیاندنەوە شاباڵ بگرن؟ بەڵێ، ئایا دەکرێت لەو سەردەمەدا پەنجە بۆ چەند سیمایەکی درەخشان ڕابکێشرێت کە دروشمی "یان سەرکەوتن، یان مردن"یان وتبێتەوە و مردنێکی سەربەرزانەیان هەڵبژاردبێت بەسەر ژیانێکی سەرشۆڕانەدا؟ دەکرێت چەند ڕۆحی ڕووناك نیشان بدرێت کە هەرگیز لە بەرامبەر فشاری دوژمنەکانماندا نەبەزیبن و لە هەموو ژیانیاندا لە ڕاستەهێڵی خۆیان لایان نەدابێت؟

بەتایبەت لەم سەردەمەدا خاڵە لاوازەکانی بەڕێوەبردن و بەڕێوەبەران گەلێك جەرگبڕە. هەرچەندە قورئان ژیانی ژێردەستەیی بەتوندی لە موسڵمانان قەدەغە کردووە، کەچی هێشتا نەمانتوانیوە لە ژێردەستەیی خۆمان ڕزگاربکەین. تکا دەکەم، ئایا دەتوانین ئینکاری ئەوە بکەین کە چەندەها ساڵە لەژێر سایەی ستەمکاراندا دەناڵێنین؟ سەرەڕای ئەوەی

ئایینە مەزنەکەمان فەرمانی پێ کردووین کە هەمیشە بێدار و وریا بین بەرامبەر بە دوژمنە سەرسەختەکانی خاك و وڵاتمان، ئەو سوێندەی قورئانی پیرۆز کە بە ئەسپ و ئامێرەکانی جەنگ دەیخوات بیری خۆتان بهێننەوە..

﴿وَٱلْعَـٰدِيَـٰتِ ضَبْحًا ۝١ فَٱلْمُورِيَـٰتِ قَدْحًا﴾ (العادیات: ١-٢)

"سوێند بەو هۆکارانەی کە تیژڕەون و نرکەونالەیان لێوە دێت، بەو هۆکارانەی کاتێك کە ئاگر دەکەنەوە و بریسکە دەدەن."

وە ئەو ئاگادارکردنەوەیەی کە فەرمانی ئامادەکردنی هەموو جۆرە چەك و کەلوپەلێکی جەنگمان بۆ دەردەکات..

﴿وَأَعِدُّوا۟ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ ٱلْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ﴾ (الأنفال: ٦٠)

"(خوا فەرمان دەدات بە کاربەدەستانی دەوڵەتی ئیسلام): هەرچی لە توانناتاندا هەیە بۆ بەهێزکردنی سوپای ئیسلام بیخەنە گەڕ و ئامادەی بکەن، لە ئامادەکردنی هەموو جۆرە ئەسپ و (هۆکارەکانی تری گواستنەوە)، کەمتەرخەمی مەکەن تا دوژمنانی خوا و دوژمنانی خۆتانی پێ چاوترسێن بکەن."

ئایا لەم ڕووەوە دەتوانرێت بوترێت کە شایستەییەکی وامان نیشان داوە کە شایانی میراتگرانی زەوی بێت؟

ڕاستی ئەوەیە کە سەردەمانێك ئێمە یەکێك لەو هەڵە گەورانەی مێژوومان ئەنجامدا کە شایانی لێخۆشبوون نییە: بۆئەوەی دنیاکەمان

ئاوەدان بێت، دینمان کرد بە قوربانی و باوەشمان کرد بە جیهانبینییەکی وادا کە دنیا بەسەر دیندا پێش دەخات.. لەو ڕۆژە بەدواوە لە "تۆڕی مەحاڵەکان"دا گیرمان خواردووە و پەلەقاژەمانە. دین دۆڕێنراوە و نەتوانراوە دنیاش بەدەست بهێنرێت.. ئیدی ئەم جیهانە شکۆدار بەڵام بەدبەختە، ڕۆژانی بەتاڵبوونەوە و داڕمانی خۆی دەژیا و میراتێکی هەزار ساڵە ڕەت دەکرایەوە.. هەوڵ دەدرا سەرەتایەکی دەستکرد بۆ ئوممەت دابنرێت.. دەوڵەتێکی مەزن لەسەر چەند ستوونێکی فشەڵی وا هەوڵی دامەزراندنی دەدرا کە توانای بەرگری نەبوو.. مێژوو و میللەت و ڕەچەڵەك و کلتوری میللی دووچاری سووکایەتی و بەکەمزانین دەبوونەوە.. وە دەچووین هانامان بۆ دوژمنانی هەزار ساڵەمان و هزرە پڕ لە دوژمنایەتییەکانی ئەوان دەبرد. ئەوانیش هاوڕێ لەگەڵ فیکرە هەرە بێباوەڕەکان و دەربڕینە پڕ لە ڕق و قینەکاندا دەهاتنە ناو وڵاتەوە.. تەنانەت ئەو کەسانەی لە ڕێگەی پەخشان و شیعرەوە بە باشترین شێوە ئەم ڕق و قینەیان دەردەبڕی، خەڵات باران دەکران و لەم دنیایەدا کە سەرتاسەری لێوانلێو بوو لە ستەملێکراو و مەحکووم و مافخوراو، هەوڵ دەدرا لەسەر ئاستی هەست و بیر و ئەخلاق کۆمیونیزم سەوز بکرێت.

تەنانەت بیرم دێت، هەروەك چۆن ئەمێستا کۆمەڵێك دەستەوسان و بێدەسەڵات و ئیلحادزەدە کە گومانیان لە خۆیان هەیە، بۆئەوەی هێرش بکەنە سەر دین و دەمدرێژی کردن بەرامبەر بە پیرۆزییەکان، هەست بە پێویستییەك دەکەن لە خۆیاندا بۆ پەنابردنە بەر ئایدۆلۆژیای سیاسی و هەندێك کەسایەتی و چەند تابۆیەك -ئەمڕۆش ناشرینترین و شەرمەزارترینی ئەم شێوازانە دەبینین و شایەتحاڵیان دەبین-، ئەو ڕۆژانەش

کە کۆمیونیزم و سۆسیالیزم ڕەواجی بوو، هەمان ئەم بەدبەختانە، بە پشت بەستن بەم سیستەمە زۆلانە، هەموو ڕق و قین و نەفرەتی خۆیان دەڕشاندەوە و لەپێناو بێدەنگکردنی دین و دینداراندا، وەك بڵێی جیهادیان دەکرد. یەکێك لە شاعیرانمان بەم شێوەیە باس لە کوژران و کوژاندنەوە و تێکدانی موسڵمان و موسڵمانێتی دەکات:

وەفا نەما، ڕێزی پەیمان هیچ، ئەمانەت لەفزی بێ مەدلوول،
درۆ خاوەنی ڕەواج و، خیانەت پێویستی و، حەق مەجهول.
دڵان بێ ڕەحم و، هەستەکان نزم و، هیواکان خار،
نیگای هەموو چاوێك، بەندەی خوا دەکات ئیستیحقار.
ژێری دەلەرزێ یا ڕەب، چ گۆڕانێکی ترسناك ڕووی داوە،
نە دین ماوە نە ئیمان، دین خەراب و، ئیمان توراب!

(محمد عاكيف)

بەڵام پێویستە ئەوە بڵێین کە سەرەڕای ئەو هەموو فشارە جەبری و کوفری و کەیفییەی کە ئەم میللەتە نەجیبە بەدرێژایی ئەم هەموو ساڵە دووچاری بووەتەوە، کەچی هێشتا نەتوانراوە بەتەواوەتی سەرکوت بکرێت و ئەو بیرۆکانەی خامۆش بکرێن کە خاوەنی ڕەهەندی ئەزەل و ئەبەدن. ئەم بیرۆکانە، جاری وا هەبووە ژیلەمۆیەك بووە لەناو خۆڵەمێشدا، جار هەبووە پزیسکێك بووە و بە کەمێك با گەشاوەتەوە، کاتی واش هەبووە هەرچەندە لەخۆیدا سەرچاوەیەکی وایە کە دەتوانێت هەموو دنیا نوقمی ڕووناکی بکات، کەچی بەیارمەتیی چەقەمێزێك هێندە بچووك بووەتەوە کە لە ناوکێکدا جێی بووەتەوە و بەو شێوەیە بازی داوە بەسەر ڕۆژگارە پڕ لە ئاستەنگەکانی سەردەمدا و گەیشتووە بە قۆناغی بەجێگەیاندنی

ئەرکەکەی و ئامادەی وەرزی خۆیەتی تا جیهان پڕبکات لە نوور.

ئەوەندە هەیە پێویستە ئێمە ئەم دەربەدەری و ئازار و ناڕەحەتی و هەوڵی چەندین ساڵە دووورودرێژە وەك خەباتێك لێی بڕوانین.. وە لە ئیسلامییەت -کە سەرچاوەی هێزە بۆ زیندووبوونەوەی ماددی و مەعنەویمان- بەجۆرێك تێبگەین کە تەبا بێت لەگەڵ ناوەرۆکیدا. هەست و بیر و شعوور و ئیرادەمان بەهێز بێت و بە خەیاڵی "بەرزکردنەوەی وشەی خوا"وە بژین و لە ژیانی زانستیماندا خاوەنی سیستەم بین و لە کار و هەڵسوکەوتەکانماندا ئەمین بین و لە بەرامبەر ئارەزووەکانی نەفسدا بەچۆکدا نەیەین و سەرکەوتووبین لە هاوسەرگیریی نێوان ژیری و دڵدا و ببین بە کۆمەڵێك بەندەی چاکەکاری وا کە بیسەلمێنین ئێمەین میراتگرانی ڕاستەقینەی سەر زەوی.

خوا یار بێت، وا بڕیارە گەشتەکەمان بە ئاڕاستەی ئەم ڕاستەهێڵە ونکراوەدا بێت.

## لە ڕێگای دۆزینەوەی ئاڕاستەکەماندا

لەو ڕۆژەوەی مەحرووم کراوین لە میراتی زەوی، ئیسلام لە بەرزەخی کەموکورتیی لایەنگرانی و دەستدرێژی و بێویژدانیی دوژمنەکانیدا، مامەڵەیەکی جەرگبڕی لەگەڵ دەکرێت. دەکرێت ستەم و دەستدرێژی دروشمی لایەنی بەرامبەر بێت، بەڵام کەموکورتیی موسڵمان شایانی قبووڵکردن نییە. پێدەچێت کاتێك پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) فەرموویەتی ''خوایە گیان پەنات پێ دەگرم لە خراپەی خراپەکار و لاوازیی چاکەکار.'' مەبەستی لەم بابەتە بووبێت.

ئەوە ڕاستییە کە وەستان و سستبوون و تەنانەت لێڵبوون و بۆنکردنی بیری موسڵمان و لۆجیکی موسڵمان، موسڵمانانی لەو ڕێگا ڕاستە دوورخستووەتەوە کە قورئان تیایدا ئامانجە و پێغەمبەریش خولگەکەیەتی.. هەر ئەم هۆکارە سیفەتی جیهانیبوونی ئیسلامی لەکەدار کردووە و ڕێگربووە لەبەردەم ئەم دینە گەردوونییەدا تا هەستێت بە ئەرکی خۆی. وا دیارە ڕاستکردنەوەی ئەم ڕووداوی لادانەی کە چەند سەدەیەکە لەناو موسڵمانان و بەتایبەت ڕابەرەکانیاندا وەك نەخۆشییەکی درێژخایەنی

لێ هاتووە، هەروەك بە کردنەوەی چەند قوتابخانەیەك و بەستنی چەند کۆنفرانسێك و سازدانی چەند کۆڕێك مەیسەر نابێت، بە چەند وتارێکی هەژارانە و چەند ئامۆژگارییەکیش تیمار ناکرێت.

بۆ ڕەواندنەوەی ئەم لادانەی کە چەندین سەدەیە ڕەگی داکوتاوە و لەم ڕۆژگارەشدا بەهۆی زانست و تەکنەلۆجیاوە ئەستوورتر بووە، پێویستە سەرلەنوێ خۆمان بدۆزینەوە و جارێکی تریش ئاشنا ببینەوە بە شعووری ئیسلامی و لۆجیکی ئیسلامی و داوەریی ژیریی (محاكمة عقلية) ئیسلامی.. پێویست بە هەوڵی زۆر و هیممەتی ڕەگداکوتاو و کاتی پێویست و سەبری لەبن نەهاتوو و هیوای زیندوو و ئیرادەی بەهێز دەکات. ئەگینا بەپێچەوانەوە، ئەگەر ئاراستەی خۆمان نەدۆزینەوە و بۆ هاتنە دەرەوە لەو چاڵەی تێی کەوتووین، لە جێگای تری جگە لە شوێنی کەوتنەکە بەدوای ڕێگای ڕزگاریدا بگەڕێین، هەم خۆمان دەخەڵەتێنین و هەم نەوەکانی داهاتووش جارێکی تر دووچاری نائومێدی دەکەینەوە.

لەم ڕووەوە، بۆئەوەی لە ڕوانگەی ئیسلامیەوە بوون و ڕووداوەکان هەڵبسەنگێنین و هەموو شتێك بە لۆجیکی ئیسلامی بپێوین، مەرجە سەرەتا بیری ئیسلامی و جیهانبینیی ئیسلامی زیندوو بکەینەوە. بۆ ئەمەش سەرەتا پێویستە زانیارییەکانمان دەربارەی گەردوون و مرۆڤ و ژیان پتەو و گونجاو بن لەگەڵ حاڵی واقیعدا و تەبا بن لەگەڵ سەرەتا (مبدأ) و ئامانجەکەیدا و دەست لە ملان و شان بە شانی یەکتر بن و گشت (کل) هاوڕێ لەگەڵ پارچەکانیدا کراوە بن بەڕووی یەکدا و وەك دەنگە جیاوازەکانی بەستەیەك وابن بە مەبەستی دەربڕینی هەمان واتا.. یان چەشنی نەخشەیەکی سەرەکی کە بێگومان پەیوەندیی مەعنەویی بە

نەخشەکانی تری دەورویەریەوە هەیە.. پاشان ژیری و داوەریی ژیریمان پڕبێت لە دنیایەك مانا و ناوەرۆك و حیکمەت و تەنانەت لێوانلێوبێت لە هەزار و یەك دانایی و وەك بڵێی کتێبێکی کراوە بێت بەڕووی هەموو بوون و ڕووداوەکاندا.. یاخود سەرجەم بوونەوەر و گشت ڕووداوەکان کە بەرهەمێکی هونەریی فرەڕەهەند و سەرسووڕهێنەرن و وەك ئاوێنەیەك ملیۆنەها ڕەنگی کاروبارە خواییەکان دەدەنەوە و خراونەتە بەردەممان بۆ موتاڵاکردن و تێڕامان لێیان، بێ ئەوەی لە ڕووداوە هەندەکی و تاکییەکانیدا نوقم ببین، بتوانین لە پارچەکاندا سەیری پشتی پەردەی گشت بکەین و لە "گشت"یشدا ڕۆبچین بە دوورەدەستترین کونج و کەلەبەرەکانی پارچەکاندا و لە یەك کاتدا هەوڵی تێگەیشتن بدەین لە هەموو گشت و تێبکۆشین لە پەیوەندیی نێوان پارچە بچووکەکان، بەڵکو پارچە هەرە بچووکەکان، تێبگەین، تا لە ئەنجامدا هەندێك لە بڕیارەکانمان هەندێکی تر لە بڕیارەکانمان، هەندێك لە کاتەکانمان هەندێکی تر لە کاتەکانمان بەتاڵ نەکەنەوە و هەڵینەوەشێننەوە و دژی یەك نەبن.

نابێت کەسانێك بەهۆی ئەم موتاڵایەوە وا بزانن ئێمە دژی پسپۆڕی و چڕبوونەوەین لە بوارێکدا. بێگومان پێویستە هەموو کەسێك لە مەیدانێکی تایبەتدا ببێت بە پسپۆڕ و لە ڕێگەی گەیشتنی بە عەرشی کەماڵاتی ئەو بابەتەی تیایدا قووڵدەبێتەوە، هەوڵ بۆ ئامانجی هەرە باڵای ئەو بوارە تایبەتییە بدات. بەڵام لەکاتێکدا ئەمە دەکرێت، نابێت مانا و ناوەرۆك و پێگە و تەنانەت ئامانجی "گشت" فەرامۆش بکرێت. ئیدی ئەمە بە یارمەتیی شعوورێکی گشتگیر و دەستەجەمعی، یان ئاراستەکردنی زانست، یان کارکردن و پێکەوەگونجانێکی کامڵ، یان

بەهۆی زیرەکییەکی لەڕادەبەدەرەوە یان بەهۆی هەر هۆکارێکی ترەوە دێتەدی. گرنگ ئەوەیە ڕووبدات و ببێت بە ڕاستی. چونکە هیچ گومانێك لەوەدا نییە کە پێویستمان بە ڕوانینێکی کوللی و گشتگیری لەم چەشنە و هەڵسەنگاندنێکی گشتی و بابەتییانەی لەم جۆرە هەیە...

بەڵێ، ئەمڕۆ لە هەموو شتێکی تر زیاتر پێویستمان بە چەند کەسێکی خاوەن ژیریی بابەتییانە هەیە کە دوێنێ و ئەمڕۆ لە یەك کاتدا ببینن.. پێکەوە و لە یەك ڕوانگەوە تەماشای گەردوون و مرۆڤ و ژیان بکەن.. بەراوردکار بن.. کراوەبن بەڕووی دیوی هۆکارەکانی ناو گەردووندا.. شارەزای سیناریۆی سەرکەوتن و لەناوچوونی ئوممەت و کۆمەڵەکانی پێشین بن.. وەك داوەرێك وابن بەسەر لایەنە باش و خراپەکانی زانستی کۆمەڵناسی و دەروونناسیی کۆمەڵەوە.. نیگابان بن بەسەر مێژووی دووبارەبووەوەی لەدایکبوون و ئاوابوون و مردنی شارستانێتییەکاندا.. خاوەنی ویژدانێکی تەندروست بن و دامەزراو بن لە بیرکردنەوەدا و هێندەش دارای بەهرە بن کە بتوانن ئامانج و ئامراز لەیەکتر جیابکەنەوە. ڕێزی ئامانج بگرن.. ئاشنا بن لەگەڵ حیکمەتەکانی شەریعەت و مەبەستەکانی خاوەنی شەریعەت.. شارەزابن لەو بابەتانەدا کە بە بناغەی بڕیارە ئاینییەکان دادەنرێن.. کراوەبن بەڕووی واریداتە خواییەکاندا...

ئەم جۆرە مرۆڤە، ڕێڕەوی گیراوی سیستەمی بیرکردنەوەمان بەردەدات.. شێوازی داوەریکردنمان کە کۆن بووە و لە ئاسمان دوورکەوتووەتەوە دەهێنێتە سەر خولگەی قورئانی و چالاکی دەکات.. کاتێکیش ئەمانە ئەنجام دەدات، هەرگیز ئەو پەیوەندییە نهێنییە فەرامۆش ناکات کە لەنێوان گەردوون و مرۆڤ و ژیاندا هەیە.. لەپاڵ

ئەوەدا کە فەرمانە ئاینییەکان بەوپەڕی جددییەتەوە لە ژیانیدا جێبەجێ دەکات، پشتبەستوو بە کارئاسانی و نەرمونیانی و لێبوردەیی خاوەنی شەریعەت، بە جۆرێك ئایین پراکتیزە دەکات کە زیاتر مژدەدەرە و دوورە لە نەفرەت و ترساندن.. زانست و هێزی بیرکردنەوەی خۆی خستووەتە ژێر فەرمانی ئیسلام و ڕاڤەکردنی ئیسلامەوە و کۆتایی بەو مەنگی و چەقبەستوویيە دەهێنێت کە ماوەی چەندین سەدەیە پێوەی گیرۆدەین.. گۆڕینی هەر لە قوتابخانەوە هەتا مزگەوت، هەر لە شەقام و کۆڵانەوە هەتا شوێنی کار، بە چەند ڕوانینگەیەك بۆ تەماشاکردنی حەقیقەتی ئەودیو بوون و مرۆڤ و ژیان.. کردنی ئیسلام بە مانشێت و سەردێڕی هەموو بوارەکانی ژیان.. هەستیاری بەرامبەر بە دەستووری کاریگەری و هۆکارێتی و، بیرکردنەوەی ماتماتیکی و لۆجیکییانە.. کۆمەڵێکی تێگەیشتووی وا کە هەڵدەستن بەم ئەرکانە و هاوشێوەکانیان و یارمەتیمان دەدەن خۆمان نوێ بکەینەوە و بناغەی هەبوون و مانەوەی هەتاهەتاییمان فێردەکەن.

لەوانەیە بەلای هەندێکەوە ئەم هەموو گرنگیدانە بە هۆکارەکان سەیر و قبووڵنەکراو بێت. منیش تا ئەندازەیەك لەگەڵیاندام. چونکە پێویستە مرۆڤ ئەرکی سەرشانی خۆی جێبەجێ بکات و دەست نەخاتە ناو کاروبارە خواییەکانەوە. ئەرك و فەرمانەکان لێپرسراوێتیی ئێمەن، دەست گرتنیش بە هۆکارەکانەوە لە حوکمی دوعایەکدایە و وەك لێدانی دەرگانەی خوای گەورە وایە بە مەبەستی ئاسانکردنی ئەنجامەکان. تێگەیشتن لەم بابەتە بەم شێوەیە، داخوازیی بەدیهێنراویی ئێمە و بەدیهێنەری و سیفەتی ئولوهییەتی ئەوە. بەڵام ئەوەندە هەیە دراوەکە

دیوێکی تریشی هەیە: خوای گەورە ئیرادەی هەندەکیی ناو ئێمەی وەك بناغەیەکی گوێڕەیی داناوە بۆ ئیرادە کوللی و ڕەهاکەی خۆی و گرنگی پێداوە و بەڵێنی داوە گەورەترین پرۆژەکان لەسەر ئەو بنیات بنێت و جێبەجێی بکات.. وە ئەم شتە گوێڕەییەی کردووە بە سەرچاوەی چاکە و خراپە و بناغەیەك بۆ سزا و پاداشت و بکەرێك کە خێر و شەڕی بدرێتە پاڵ.. ئەم ئیختیارە هەندەکییەی کە لە خۆیدا هیچ نییە، لە ڕووی ئەو ئەنجامانەوە کە لێوەی سەرچاوە دەگرن، بەهایەکی زۆری بەدەستهێناوە و بێگومان گرنگییەکی زۆر بە مەیل و ئارەزووەکانی دەدرێت. چونکە ئەگەر وا نەبووایە، ژیان بەتەواوەتی دەوەستا و مرۆڤەکان بەردەبوونەوە بۆ ئاستی بێگیانەکان و تەکلیف پووچەڵ دەبووەوە و هەموو شتێك سەری لە بێماناییەوە دەردەچوو.. خوای گەورە هەندەکی ئیختیاریی مرۆڤی کردووە بە هۆکارێکی سادە بۆ ئاوەدانکردنەوەی دنیا و عوقبا و ئامرازێکی ڕێزلێگیراو و دوگمەیەکی جادوویی بۆ سیستەمێکی کارەبایی کە هەموو جیهان ڕۆشن دەکاتەوە و بەوەی کە خوای گەورە لە دڵۆپێکدا دەریا و لە گەردیلەیەکدا خۆر و لە هیچدا جیهان دەخوڵقێنێت، ڕەهەندێکی نهێنیی قودرەتی خۆیمان نیشان دەدات.

بەڵێ، نە هۆکارەکان و نە هیچ شتێکی تریش ناتوانێت فەرمان بەسەر خوادا بکات. وە ناتوانێت ببێت بە ڕێگر لە بەردەم ئیرادە و مەشیئەتی خواییدا. هەموو شتێك مەحکوومی خوایە و خواش تاقە حاکمی ڕەهایە. بەڵام چاودێریکردنی هۆکارەکان و ئەژمارکردنیان وەك چەند ئامرازێکی بچکۆلانە، دیسان فەرمانی خوایە. لەم ڕووەوە باوەڕمان وایە ئەگەر مرۆڤ ڕەچاوی یاسا سروشتییەکان نەکات کە عادەتی خوایین، بە

ڕێژمیەکی زۆر لەم دنیایەدا و بە ڕێژمیەکی کەمیش لە دواڕۆژدا سزادەدرێت.

کاتێك حەزرەتی عومەر ناوچەیەك جێدەهێڵێت کە تاعوونی تێدا بڵاوبووەتەوە و کەسانێکیش کە ناتوانن ئەم ڕەفتارەی ئەو لەگەڵ باوەڕ بە قەزا و قەدەردا یەکبخەن، پرسیاری هۆکارەکەی لێ دەکەن. ئای وەڵامەکەی چەند مانادارە کاتێك دەفەرموێت "لە قەدەری خواوە بۆ قەدەری خوا ڕادەکەم!"[1]

لە کار و کردەوە و جووڵەدا ڕەچاوکردنی ئەنجام و بەرووبووم و ئنجا کردنیان بە مەبەستی سەرەکی و چوونە ژێر باریەوە، هەم دەبێت بە هۆکاری ناڕەحەتی و ئازار، هەم -حاشا- وەك ئاڵوگۆڕ و بازرگانییەك وایە لەگەڵ خوای گەورەدا، کە ئەمەش بێگومان بێڕێزییە. بەپێچەوانەشەوە دەستبەردان لە ئیرادە و پاشان چاوەڕێ کردنی ئەنجامی نائاسایی و سەرسووڕهێنەر، ناوێکی تری خەیاڵپڵاوی و دەستەوسانییە. مەگەر قورئانی پیرۆز کاتێك لە چەندین جێگادا:

﴿جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ﴾ التوبة: (٨٢، ٩٥)

"لە پاداشتی ئەو کاروکردەوەیەی دەیکەن."

﴿جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾

(السجدة: ١٧) (الأحقاف: ١٧) (الواقعة: ٢٤)

"لە پاداشتی کاروکردەوەی چاك و پاکیاندا کە ئەنجامیان دەدا."

---

١. البيهقي، السنن الكبرى ٢١٧/٧.

و ئایەتەکانی هاوچەشنیاندا ئەوە یادی مرۆڤەکان ئاخاتەوە کە هەر شتێکی باش یان خراپ لە ڕابردوودا بەسەریاندا هاتووە یان لە داهاتوودا دێتە ڕێیان، هۆکارەکەی کار و کردەوە و ڕەفتاری خۆیان بووە؟! مەگەر مایەی شانازیی مرۆڤایەتی و مەزنترین نموونەی هاوسەنگیی نێوان دڵ و ژیری و ویژدان نافەرموێت "لە ڕۆژی دواییدا بەندە ناتوانێت یەك هەنگاو بنێت هەتا لێی نەپرسرێتەوە کە تەمەنی لە چیدا بەسەربردووە و زانستەکەی چۆن بەکارهێناوە و ماڵ و سامانەکەی چۆن دەست کەوتووە و لە چیدا بەکاری هێناون و جەستەی لەپێناوی چیدا پرتووکاندووە."[١] ئایا بەم فەرموودەیە ئاماژە بەو پەیوەندییە بەتین و ڕازئامێزەی نێوان هۆکار و ئەنجام و هەوڵ و بەرهەم ناکات؟

کاتێك ئیسلام لە ڕێگەی قورئان و سووننەتەوە ژیانی دنیا و عوقبای ئیماندار و حاڵەتی بیروباوەڕ و ڕەفتار و چۆنێتیی عیبادەت و ڕەوشتی ڕێکدەخات، لە هەمان کاتدا و لەنێوان دێڕەکاندا، شتانی جیاواز لە جیهانەکانی ئەودیوەوە بە دنیای ڕۆح و ژیری و ویژدان و هەستەکانماندا دەچێنێت و بەوەدا کە لە قووڵایی بوونی ئیمانداردا شەماڵی ئاخیرەتی و هەستی ڕەنگکراو بە لاهوت بەرهەم دەهێنێت، هەموو ساتێك لە ڕەهەندێکی جیاوازدا ئەو زیندوو دەکاتەوە. بەم جۆرەش مرۆڤ خۆی لە پێگەی جێنشینیی خوای گەورە و مافی دەستوەردان لە بەدیهاتووان و تێگەیشتن لە نهێنی و مەبەستی کاروبارە خواییەکاندا دەبینێتەوە. پاشان ئەو کتێبی گەردوونەی کە لە ئیرادە و قودرەتەوە سەرچاوەی گرتووە لەگەڵ ئەو مانایانەدا کە لە کتێبی گوفتارەوە شەپۆل دەدەن،

---

١. الترمذي، القيامة ١.

بە دوو ڕووی یەك شتیان دەزانێت.. وێناکردن و بیرکردنەوەکانی، ژیان و هەڵسوکەوتەکانی، تێبینییەکانی لەسەر دنیا و ئاخیرەت، بەگوێرەی ئەو هاوسەنگی و ڕێسایە ڕێکدەخات کە لە زەوی و ئاسمانەکاندا هەیە.

بەڵێ، ئەو تاڵانەی کە لە چنراوی ئیسلامدا هەریەکەیان ماکێکی سەرەکین، لەسەر ژیری و ویژدان و ڕۆح و جەستە هەڵچنراون و بەم جۆرەش ئەو ڕەنگە ناوازە و سەرسووڕهێنەرانەی لێوە دەرکەوتوون کە هەڵگری هەردوو ڕەهەندی دنیایی و ئاخیرەتین. لەم ڕووەوە ئەگەر هەریەکێك لەم تاڵانە جاروبار بکەوێتە پێش ئەوی ترەوە، هیچ یەکێکیان بە تەنها نە دەتوانێت ڕەنگی ئەو بداتەوە، نە دەشتوانێت نوێنەرایەتی بکات و دەریببڕێت.

ئیسلام کە بریتییە لە گەورەترین و گشتیترین دیاریی بەدیهێنەر بۆ هەموو کەسێك، تەنها بوونەوەرێك دەتوانێت هەڵیبگرێت کە پوختەی مەعنەویی هەموو بوونە و لە ژیری و ویژدان و ڕۆح و جەستە و لایەنە ناسکەکانی تر -کە ئەمانیش دیارییەکی تری خوایین و لە بەخششە سەرەتاییەکانن- پێکهاتووە.

دەخوازین ئەم بابەتە لە ئایندەدا زیاتر ڕوون بکەینەوە.

## بەرەو دنیای سبەی

جیهانی ئیسلام ئەم چەند سەدەیەی دوایی لەناو کۆمەڵێك بازنەی داخراوی خراپەدا دەسووڕێتەوە و هەرچەند دەکات ناتوانێت ڕوو لە ناوەرۆك و ڕۆحی تایبەتی خۆی بکات. ئەگەر بێت و دوو هەنگاوی ڕاست بنێت، خێرا بەدوایدا چەندین هەنگاو بەرەو دواوە دەگەڕێتەوە، یان دووچاری چەندەها لادانی جیاواز دەبێت. تەنانەت زۆربەی جار ئەم ڕۆیشتنە شوومە یاخود ئەم لادانە بێکەڵکە کە خراپەکانی لە چاکەکانی زۆرترە و لەگەڵ شتە زیانبەخشەکاندا شتە سوودبەخشەکانیش لەناودەبات، کاریگەریی نەرێنی هەبووە لەسەر گەڕانی کۆمەڵگا بەدوای خۆیدا لەناو خۆیدا و هەوڵی خۆدۆزینەوەی و لە ئەنجامیشدا لەرزەی بە کارە جوانەکان و بکەرەکانیشیان خستووە. ئەمەش ئەوە نیشان دەدات کە لەم جیهانە گەورەیەدا هەموو شتێك لە شیرازەی خۆی دەرچووە و چەرخی دەوڵەت و میللەتان لە دژی خۆیان هەڵدەسووڕێت.

بۆیە ئێمە لەم ڕووەوە باوەڕمان بە پێویستی نوێبوونەوە هەیە لە سەرتاسەری جیهانی ئیسلامیدا و لەناو هەموو چین و توێژەکاندا و

لەسەر ئاستی تێگەیشتنی ئیمانی، تێگەیشتن لە ئیسلام، تێگەیشتن لە ئیحسان، عەشق و شەوق، ژیری، لۆجیك، شێوازی بیرکردنەوە، شێوازی خۆدەربڕین، لەسەر ئاستی هەموو ئەو دامەزراوانەش کە بڕیارە ئەم کارانەی بۆ جێبەجێ بکەن.

بناغەی ژیانی مەعنەویی ئێمە تێگەیشتنی ئیمانی و جیهانبینی دینییە. هەروەك هەتا ئەمڕۆ بوونمان وابەستەی ئەمانە بووە، بەهەمان جۆر هەر بە پشتبەستن بەمانە سەرکەوتنەکانمان تۆمارکردووە. ئەگەر لەمانە داببڕێین و دووربخرێینەوە، خۆمان لە جێگایەکدا دەبینینەوە کە تەنانەت هەزار ساڵ دواکەوتووترە لە ئێستامان. دین کە ئامانجی مانا بەخشینە بە مرۆڤ و بوونەوەران و بریتییە لە کرانەوە بەڕووی ناوەڕۆك و ڕۆحی مرۆییدا و بەدیهێنانی ئەو ئارەزووانەی کە لەم جیهانەدا جێیان نابێتەوە و وەڵامی هەستی هەمیشەیی ناو ویژدان دەداتەوە.. ئەم دینەی کە بریتییە لەم شتانە و بابەتەکانی تری هاوچەشنیان، تەنها لە پەرستشەکاندا قەتیس نەبووە. بەڵکو هەموو ژیان لە باوەش دەگرێت.. دەست وەردەداتە هەموو شتێکی ژیری و ڕۆح و دڵمانەوە.. وە بەگوێرەی نییەتەکانمان ڕەنگی خۆی لە ڕەفتارەکانمان دەدات و هەموو شتێك بە ڕەنگی خۆی بۆیە دەکات.

بەڵێ، دینداری ڕاستەقینە هەموو ڕەفتارێکی لە خولگەی عیبادەتدایە و هەموو هەوڵێکیشی ڕەهەندی جیهادی هەیە و هەموو جووڵەیەکیشی ڕەنگی عوقبا و ڕەزامەندی پێوەیە. لە ژیانی ئەودا شتێك بە ناوی جیاکاری لەنێوان دنیا و عوقبادا نییە.. هیچ بەرزەخێك نییە لەنێوان عەقڵ و ژیریی ئەودا.. هەستەکانی لەگەڵ لۆجیکیدا دەست لەملانن..

داوەرییەکانی ژیریی ئەو دژایەتی لەگەڵ ئیلهامەکانیدا ناکەن. بەهەمان شێوە، لە دنیای بیرکردنەوەی ئەودا ئەزموون بریتییە لە پلیکانەیەکی نوورانی کە بەرزدەبێتەوە بۆ عەقڵ، زانستیش بورجێکی یەکجار بەرزە و بە فیراسەت دەورەدراوە. ئەو لەسەر ئەم پلیکانەیە هەڵۆیەکە، هەمیشە بە باڵە مەزنەکانی عەشق بەرەو ئەبەدییەت دەفڕێت و لەم بورجەدا بە فەتانەتەکەی هەلاجێکە کە هەموو کونج و قوژبنێکی بوون شیتاڵ دەکات. لەبەرئەوەی لە هیچ جێگایەکی ئەم جۆرە تێگەیشتنەدا بۆشایی نییە، ئەوا لەم سیستەمەدا شتێك بە ناوی فەرامۆشکردنی لایەنێکی کەسی یان کۆمەڵایەتیی مرۆڤ بوونی نییە.

ئەوانەی دین لەگەڵ ژیری و زانست و بیرکردنەوەدا دەدەن بە شەڕ، کۆمەڵێك بەدبەختی وان کە بێناگان لە ڕۆحی دین و ڕۆحی ژیریش. بەتایبەت ئەگەر لە پێکدادانی نێوان چینە جیاوازەکانی کۆمەڵگادا دین بە لێپرسراو بزانرێت، خەڵەتانێکی تەواوەتییە. پێکدادانی نێوان چینەکان لە نەزانی و بەرژەوەندیی تاکەکەسی و هەڵپە و تێرنەخۆریی چینەکانەوە سەرچاوە دەگرێت. دین پشتگیری لە هیچ یەکێك لەم هەست و بیرانە ناکات. ئەوە ڕاستییە کە لەنێوان هەندێك لە دیندارەکانیشدا پێکدادان و گرژی ڕوودەدات، بەڵام هۆکارەکەی ئەوەیە هەرچەندە ئەم مرۆڤانە هەڵگری هەمان ڕۆحن، بەو شێوەیەی کە پێویستە باوەڕیان نەهێناوە و ئیخلاسیان نەپاراستووە.. جاری واش هەیە بەهۆی شوێنکەوتنی هەستەکانیان دووچاری ئەم حاڵەتە دەبن. ئەگینا فەزیلەتێك کە لە ئیمانەوە سەرچاوەی گرتووە هەرگیز بە بەدبەختییەکی لەم شێوەیە ڕازی نابێت.. لەڕاستیدا بۆئەوەی نەکەوینە بەدبەختییەکی لەم جۆرەوە

تەنها یەك ڕێگامان لە بەردەمدایە، ئەویش بریتییە لەوەی كە دین بە هەموو دەزگاكانیەوە لە ژیاندا جێبەجێ ببێت و ببێت بە گیان و خوێنی كۆمەڵ.

بەڵێ، كۆمەڵگەی ئیسلام لەسەر ئاستی توانای عەقڵی و ڕۆحی و هێزی بیركردنەوە پێویستی بە چاكسازیی جددی، بە دەربڕینێكی زیندووتر، بە زیندووبوونەوەیەكی نوێ هەیە. زیندووبوونەوەیەك كە بە جددی هەوڵ بۆ پاراستنی ئەسڵی دین دەدات و بە یارمەتی ئەو نەرمی و گشتگیرییەش كە لە دەقەكاندا هەیە، پێویستیی هەموو جۆر و چینەكانی مرۆڤ جێبەجێ دەكات و سەرتاپای ژیان لە باوەش دەگرێت...

لەو ڕۆژەوەی سێبەری ئەم سیستەمە موبارەكە لەژوور سەرماندا هەست پێدەكەین -خوای گەورە بۆ هەمیشە لێمان كەم نەكات!- چەندین جار دەرگای لەسەر نوێبوونەوە و چاكسازی واڵا كردووە و چەندەها كەڕەت ئەزموونی زیندووبوونەوەی كردووە. مەزهەبەكان بە گشتی نوێنەرایەتیی ئەو زیندووبوونەوەیەیان كردووە كە لە بواری فیقھ و یاسادا ڕوویداوە. هەرچی تەریقەتەكانیشە وەك شاڕێگایەك وابوون بۆ گەیشتن بە ڕێچكەكانی دڵ و ڕۆح. قوتابخانەكانیش تا ئەو كاتەی كە خۆمانە بوون، سەرقاڵی تەفسیركردن و مانابەخشین بوون بە گەردوون و بوون. ئەو نوێبوونەوە و زیندووبوونەوەیەش كە ئەمڕۆ خەیاڵی ئێمەی داگیركردووە، بە تێكەڵكردنی هەموو ئەمانە و گونجاندنیان لەگەڵ یەكتردا مەیسەر دەبێت، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت كە لە هەموو بوارەكاندا ڕوخسار تێبپەڕێنین و بگەین بە ناوەڕۆك، قاڵبی دەرەكی بشكێنین و

ڕاستەوخۆ ڕوو لە ڕۆح بکەین. واتە بە گەیشتن بە یەقین لە باوەڕدا و ئیخلاس لە کردەوەدا و ئیحسان لە هەست و بیرکردنەوەدا...

بەڵێ، پێویستە عیبادەتەکان لە ڕووی چەندێتییەوە تەواو و، چۆنێتی تیایدا ئامانج بێت و، لە دوعاشدا وشە ئامراز و هۆکار و، ڕۆح و دڵسۆزی تیایدا بناغە بێت و، لە ڕەفتارەکانیشدا سوننەت ڕابەر و شعوور تیایدا چاوساغ بێت و، لە هەموو ئەمانەشدا پێویستە خوا ئامانج و مەبەستی کۆتایی بێت. نوێژ، هەستان و دانیشتن نییە.. زەکاتیش هەرگیز فڕێدانی بەشێك لە ماڵ و سامان نییە -بە مەبەستی دوورخستنەوەی زیانەکان- بۆ جێگایەك کە کەس نازانێت چی لێ دێت.. ئەگەر ڕۆژووش بریتی بێت لە برسیبوون و تینووبوون، ئیتر چ جیاوازییەکی لەگەڵ پارێزدا هەیە؟ حەج، ئەگەر لە خولگەی تایبەتی خۆیدا جێبەجێ نەکرێت، چ جیاوازییەکی هەیە لەگەڵ گەشت کردن لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر و خەرجکردنی پارە تیایدا؟ دڵخۆشبوون بە چەندێتی لە عیبادەتدا وەك یاری منداڵان وایە.. پێدەچێت هات و هاوار لە دوعادا کاری ئەوانەبێت کە بەدوای کرێی قورگدا دەگەڕێن.. حەج و عومرەیەکیش کە لە ناوەرۆکی ڕاستەقینەی خۆیان دوورن، ئەگەر شتێکی جیاواز نەبن لەوەی تەنها نازناوی "حاجی"مان بۆ دەستەبەر بکەن و بە ڕووداو و بەسەرهاتەکانی حەج دڵنەوایی خۆمان بدەین، ئەوا لە ڕووی مانابەخشینەوە دووچاری کێشە دەبین...

تاکە ڕێگای چارەسەر بۆئەوەی لە ناوەندی ئەم هەموو شتە نەرێنییانەدا لەناونەچین ئەوەیە کە سەفەربەرییەکی گشتی ڕابگەیەنین بۆ پێگەیاندنی کۆمەڵێك پزیشکی ڕۆح و مانا کە بۆشاییەکانمان

پردەکەنەوە و خاڵە لاوازەکانمان ناهێڵن و لە بەندایەتیی جەستە و مادده ڕزگارمان دەکەن و بەرەو پلەکانی ژیانی ڕۆح و دڵ ئاڕاستەمان دەکەن. دەستەیەك پزیشکی ڕۆح و مانای وا کە هەر لە فیزیکەوە هەتا مێتافیزیك، هەر لە ماتماتیکەوە هەتا ئەخلاق، هەر لە هونەرە جوانەکانەوە هەتا تەسەووف، هەر لە کیمیاوە هەتا ڕۆحانییەت، هەر لە گەردووناسییەوە هەتا نەفسناسی، هەر لە یاساوە هەتا فیقهـ هەر لە سیاسەتەوە هەتا سەیر و سلوك، بەکورتی دڵیان بەڕووی هەموو زانست و زیرەکی و عیرفان و واریدات و فیوزاتێکدا والا و کراوەیە. ئەم نەتەوەیە پێویستی بەم شت و بەو شت نییە، بەڵکو موحتاجی مێشکێکی لەم جۆرەیە. هەروەك چۆن مێشك بەهۆی دەمارەکانەوە گفتوگۆ لەگەڵ هەموو لایەکی جەستەدا دەکات و پەیام بۆ دوورترین و چەپەکترین گۆشە دەنێرێت و وەردەگرێت، ئەم دەستەیەش کە وەك مێشك وان، پەیوەندی لەگەڵ هەموو گەرد و گەردیلە و ئاوێتەیەکی جەستەی نەتەوەدا گرێ دەدەن و لە هەموو ئەو یەکانەی کە کۆمەڵگە پێکدەهێنن نزیك دەبنەوە و دەستیان لە گشت بەشە گرنگەکانی ژیاندا دەبێت.. وە شتانێك لە ڕۆح و لە مانا -کە لە ڕابردووەوە هاتوون و لە ئێستادا پتر قووڵبوونەتەوە و پەلیشیان بۆ داهاتوو کێشاوە- دەدەن بە گوێی هەموو کەسێکدا.

ئەم دەستەیە هەر لە خوێندکارە بەئەدەب و گوێڕایەڵەکانی قوتابخانەوە هەتا ئەو ڕۆڵانەی ئوممەت کە لە کۆڵانەکاندا ئاوارە و سەرلێشێواون، باوەش بۆ هەموو کەسێك دەکەنەوە و بە پڕکردنی سینەی هەمووان لە ئیلهامەکانی ڕۆح، بەجۆرێك پەروەردەیان دەکەن کە ببن بە خاوەنی زانست و هونەر و پێشکەوتنی سبەینێ و دەیانخاتە خزمەتی سوود گەیاندن بە

کۆمەڵگەوە و بە ماڵی ڕووناك و بەشی ناوخۆیی و قوتابخانە و زانکۆ و پەرستگا و تەکیەکەشی، هەموو کەسێك و سەرجەم لایەنەکان لە شتە بۆگەنەکانی سەردەم ڕزگاردەکەن و ڕووەو کەماڵاتی مرۆیی ئاڕاستەیان دەکەن.

دیسان هەمان ئەم دەستەیە، چەکە بەهێزەکانی میدیا وەك ڕۆژنامە، گۆڤار، ڕادیۆ و تەلەفزیۆن دەستەمۆ دەکەن و لە لایەك دەیانکەن بە دەنگ و هەناسەی ژیانی دینی و میللی، لە لایەکی تریشەوە چۆنێتیی بوون بە مرۆڤ پیشانی هەستە تاریك و بیرکردنەوە لێڵ و دەنگە ڕەشەکان دەدەن.

دیسان هەر ئەم دەستەیە، دام و دەزگاکانی پەروەردە و فێرکردنمان کە بە کاریگەریی پەستانە دەرەکی و لادانە ناوخۆییەکان هەر ڕۆژە و بەگوێرەی هەوای ڕۆژگار شکڵ و ئاڕاستە دەگۆڕێت، لە ژێردەستەیی ئەورووپا و ئەمریکا دەردەهێنن و بە جۆرێك ڕێکی دەخەن کە لەگەڵ ڕابردووی خۆیدا تەبایە و وەڵامی پێویستییەکانی ڕۆژگار دەداتەوە و بەرزی دەکەنەوە بۆ پێگەیەك کە خاوەنی پرۆگرام و شێواز و میکانیزمی ئامانجدار بێت.

لە سایەی ئەمەدا وەکو نەتەوە، لە نەداریی هەست و بیرکردنەوە و لاسایی و چاولێکەرییەوە بەرەو بیری زانستیی ڕاستەقینە و، لە تەزکییەکردنی چەندین ڕەزالەت بە ناوی هونەرەوە بەرەو هونەر و ئیستاتیکای ڕاستەقینە و، لە کۆمەڵێك دابونەریت و عادەتەوە کە سەرچاوەیان نادیارە بەرەو شعوورێکی ئەخلاقیی وا کە لە دین و مێژووەوە

سەرچاوەی گرتووە و، لەو هزرانەی ناو سینەمان کە کەلەپچەیان کردووین و لەناویان بردووین، بەرزدەبینەوە بۆ یەکەی نەگۆڕی خزمەت و ملکەچبوون و شعوور و تەوەککول.

ئیدی لە دنیادا با هەر هات و هاواری پێکهاتەی نوێ بکرێت. لەڕاستیدا ئێمە باوەڕمان وایە نە لە سەرمایەداریی شڕ و، نە لە فەنتازیای کۆمیونیزم و، نە لە سۆسیالیزم کە پاشماوەی تێکشکاوی ئەوە، نە لە موتوربەی سۆسیال دیموکراسی و، نە لە کۆنەی لیبرالیزمەوە هیچ شتێکی نوێ پەیدانابێت. ڕاستی ئەوەیە ئەگەر جیهانێك هەبێت لە دنیادا کە بەڕووی پێکهاتەیەکی نوێدا کراوەبێت، ئەوە جیهانی ئێمەیە. نەوەکانی داهاتووش دەتوانن ئەمە بە ڕێنیسانسی ئێمە ئەژمار بکەن.

ئەم سەرلەنوێ زیندووبوونەوەیە قووڵییەکی زۆر جیاوازتر لەوەی تا ئێستا هەبووە دەبەخشێت بە دنیای هەست و بیرکردنەوەمان و تێگەیشتنیشمان لە هونەر و ئیستاتیکا. لە سایەی ئەمەدا چێژە داهێنەرەکانی خۆمان دەدۆزینەوە و، دەگەین بە مۆسیقای خۆمان و ڕۆمانتیزمی خۆمان تام دەکەین.. وە نەتەوەکەمان لە هەموو بوارەکاندا، هەر لە زانستەوە تا هونەر، هەر لە هزرەوە هەتا ئەخلاق، لەسەر چەند ستوونێکی بەهێز دادەنێین و داهاتووی ئەو مسۆگەر دەکەین.

لەم مەیدانەدا هەڵمەت و چاپووکی دروشممان و ئیمان و شعووری حەقیقەتیش سەرچاوەی هێزمان دەبێت. ئەوانەی کە تا ئێستا لە دەرگاکانی تردا ئێمەیان دەگەڕاند و چاوەڕێی شیفایان لە بێباوەڕی و بێڕەوشتی دەکرد، هەمیشە بەهەڵەداچوون. ئێمە هەموو کاتێك لە سایەی

تەسلیم بوون و گوێڕایەڵیمان بۆ ئەو خوایەی کە لە دڵەوە پەیوەستین پێوەی و ئەو ئوممەتەمان کە هەڵیدەبژێرین بەسەر هەموو شتێکی تری دنیاییدا و ئەو خاکەش کە لە سینەیدا گەورە بووین، بەسەربەرزی گەیشتووین و بەسەربەرزیش ماوینەتەوە. نازانم داخۆ پێویست دەکات پێچەوانەکەی ڕوون بکەمەوە؟..

لە وتارەکانی داهاتوودا ئەم لەدایکبوونە نوێیە لە شێوەی چەند بەشێکدا پێشکەش دەکەین.

# بەرەو دنیاکەمان

هەتا ئێستا لە سەردەمە جیاوازەکاندا و لە شوێنە جۆراوجۆرەکانی دنیادا و لەژێر هەر ناونیشانێکدا بووبێت، زوو زوو باس لە دروستبوونی پێکهاتەی نوێ کراوە و هەموو کاتێکیش دەکرێت گفتوگۆ بکرێت لەسەر ئەوەی داخۆ ئەم بانگەشەیە ڕاستە یان نا. بەڵام جیهانێك هەیە کە پێکهاتنێکی لەم شێوەیە تیایدا ڕوودەدات و هەموو بوون و ئەودیو پەردەی بوون و مرۆڤ و ژیان لەباوەش دەگرێت، ئەم جیهانە لە هەموو ئەو کۆت و سنوور و بەندانە ئازادە کە لە سەرەوە باسکران. بێگومان ئەم جیهانە، بەتایبەت ئەگەر کاتێکی دوور و درێژ لەبەرچاو بگیرێت، تەنها جیهانی ئێمەیە.

ئەم دنیایە، دوای هەژان و قەیرانێکی چەندین سەدەیی، لەمرۆشماندا سەرەڕای هەموو شتێك هێزی ئەوەی هەیە ئەم پێکهاتنە نوێیە بهێنێتە دی و خاوەنی ماتەوزەیەکی وایە کە بتوانێت ژیانەوەیەکی تازە بەرپابکات و هێندەش دارای زانین و ئەزموونە کە ڕابەرایەتیی هەموو ئەو پێکهاتنە نوێیانە بکات کە لە چواردەوریدا ڕوودەدەن. بەڵێ، ئەو هەموو شتێکی

ئامادە و تەواوە، بەڵام ئەوەندە هەیە کە پێویستە ئەو پاڵنەرە مێژووییانەی کە بە گیان و خوێنی ئەو ڕابردووە دوور و درێژ و شکۆدارە دادەنرێن، جارێکی تر لە شوێنی گونجاوی خۆیاندا بەکاربهێنرێن!..

سەردەمانێك لە زانستە سروشتییەکانەوە هەتا زانستە ئایینییەکان، لە تەسەووفەوە تا لۆجیك، لە شارداربیەوە تا جوانناسی و لە هەموو بوارەکانی تردا بە بلیمەتگەلێکی وەك "خاریزمی" و "بیروونی" و "ئیبن سینا" و "زەهراوی" کە کون و قوژبنی بوونیان شیتەڵ دەکرد، بە مامۆستایانی یاسا و فیقهی وەك "ئەبو حەنیفە" و "ئیمام محەممەد" و "سەراهسی" و "مەرگینانی" و بە تواناگەلێکی وەك "ئیمامی غەزالی" و "شێخی ڕازی" و "مەولانا" و "شاهی نەقشبەند" کە بەهۆی یەکخستنی دڵ و ژیرییەوە لە خولگەی ویژداندا ژیان و لێهاتنێکی وایان نیشاندا کە لە سەرووی نۆرمە مرۆییەکانەوەیە و، بە قارەمانانی داوەریی ژیری و فەتانەتی وەك "ئیمامی ماتوریدی" و "تەفتازانی" و "سەیید شەریف" و "دەووانی" و، بە بلیمەتگەلێك لە بواری هونەردا وەك "میعمار خەیرەددین" و "میعمار سینان" و "عیتری".. ئەم دنیایەی کە هەمیشە زۆر زۆر لە پێش ڕۆژگاری خۆیەوە بووە، دوای دابڕانێکی کاتی دەتوانێت سەرجەم ژیری و ڕۆحە ڕووناکەکانی ناو خۆی بخاتە گەڕ و دووهەم یان سێهەم ڕێنیسانسی خۆی بهێنێتە دی. بەڵێ، ئەم دنیایە دەتوانێت جارێکی تر هەر لە هەستکردن بە ڕۆح و مانای ئیسلامەوە هەتا سەرلەنوێ ڕاڤەکردنەوەی بوون، لە هەرێمی فراوانی لاهوتیی تەسەووفەوە تا مێتافیزیکی گەردوونی، لە موحاسەبە و موراقەبەی ئیسلامییەوە هەتا بێداری (التيقيظ) و توانا (التمكين)ییەك کە نرخ و بەهایەکی یەکجار

مەزن بە مرۆڤ دەبەخشن، لە شار و شارداریيەکەوە کە دەتوانین جیهانی ناوەوەمانی تێدا هەڵبمژین هەتا ئیستاتیکایەك کە بووە بەماڵی زۆربەی خەڵك. بەڵێ، ئەم دنیایە دەتوانێت ئەم لاپەڕە نوێیە بکاتەوە، هەرچەندە پێناچێت کارێکی زۆر ئاسان بێت.

ئەستەمە لاپەڕەیەکی نوێ هەڵدەینەوە هەتا ئەو کاتەی بیرکردنەوە سەقەت و تێگەیشتنە لار و چەوتەکان -وەك کوژاندنەوەی ژیانی ڕۆح بەدرێژایی چەندەها ساڵ لەم وڵاتەدا، لەکارخستنی دنیای دینیمان، لەبیربردنەوەی عەشق و بەستنەوەی زمانی دڵەکان، چەقینی ڕۆشنبیرە خوێنەر و بیریارەکانمان لە ماددییەتی چڕوپڕدا، برەودان بە چاولێکەری لەبری خۆگری و دامەزراوی لەسەر حەق، تەنانەت داواکردنی ئاخیرەت و بەهەشت بەجۆرێك وەك ئەوەی بەردەوامیی ئەو بەختەوەرییە دنیاییە بێت کە زۆربەی خەڵك لەگەڵی ڕاهاتوون- لە سینەمان ڕیشەکێش نەکەین.

ئەمە مانای ئەوە نییە کە دەرهێنان و فڕێدانی ئەو خراپانەی بەدرێژایی ئەم چەند سەدەیەی دوایی ڕۆحمانی تەنیوە مەحاڵە. بەڵام ئەگەر هۆکارە ڕاستەقینەکانی ڕووخان و پووکانەوەمان وەك هەڵپە و تەمبەڵی و ئارەزووی ناوبانگ و خۆشەویستیی پلە و پایە و خۆپەرستی و دنیاپەرستی فڕێنەدەین و ڕوو لە بێنیازی (إستغنا) و ئازایەتی و خۆبەکەمزانی و خەمخۆری و ڕۆحانییەت و ڕەببانییەت نەکەین کە کرۆکی حەقیقەتی ئیسلامیشن لە هەمان کاتدا و ئنجا ئەگەر ئەم تێگەیشتنە هەموو ئوممەت نەگرێتەوە، مانای وایە کارەکە یەکجار سەختە. بەڵام ئەوەش ناگەیەنێت کە بەتەواوەتی ئەستەمە.

ئەگەر لەناوماندا چەند پاڵەوانێك هەبن -کە هەن- لە ئاستی ناوەرۆکی خۆیاندا بە ڕاستگۆیی مابێتنەوە و، خاوەنی ئیرادەیەکی نوێگەریی وابن کە ڕۆژگاری خۆیان لەباوەش بگرێت، بێگومان ڕۆژێك هەر دێت کە ئەم گۆڕان و نوێبوونەوەیە ڕوودەدات. گۆڕان و نوێبوونەوەیەك کە ڕەهەندەکانی قورئانین و چوارچێوەکەشی سروشتی و مرۆییە.. تەنانەت بەجۆرێك ڕوودەدات کە ئەو کەسانەی هێشتا بەڕووی ئەم تێگەیشتنەدا داخراون و سووریشن لەسەری، ناتوانن ڕێگەی لێ بگرن. چونکە هەموو ئەو ڕێنیسانسانەی کە تا ئێستا لەسەر ئاستی جیهان ناسیومانن بەرەنجامی بلیمەتە شەخسییەکان بوون کە وەك ئەندازیارانی ئەم کارە وابوون، نەك هەڵمەت و جووڵەی کۆمەڵانی خەڵك.. بەڵێ، هەروەك لەدوای پەیدابوونی ئیسلام، لێرە و لەوێ گۆڕان و نوێبوونەوەکان کە وەك تەقینەوە وابوون، بەرهەمی دەستەیەك ڕۆحی ناوازە و بلیمەتی ناوازە و بیری ناوازە بوون کە لە سەردەمی ئەمەوی و عەبباسییەکاندا پێگەیشتن، بەهەمان جۆر لە سەردەمی ئیلخانی و قەرەخانی و سەلجووقی و عوسمانییەکانیشدا هەمان ئەم "چەقە هێز"ی بیری فراوان و ڕۆحی قووڵ و سروشتە پاکە بوو کە لە پشتی ئەم جووڵە و پێکهاتنانەوە بوو. ئەم ڕۆحە ڕابەرانەی کە بەنزیکەیی لە هەموو سەردەمێکدا بە وزەیەکی گەرموگوڕەوە دەرکەوتوون، شارێیەکی وایان لێداوە کە بە تێپەڕبوونی کات بوون بە قوتابخانەیەك و ڕۆحی ئەم نوێبوونەوەیەیان وەك نەفەسێك کردووە بە بەری کۆمەڵانی خەڵکدا. کەسانێکیش کە دواتر هاتوون شوێنی ئەم ڕۆحە ڕابەرانە و فیکرەکانیان کەوتوون، خەڵکانیش شوێن پێیان هەڵگرتوون و پەنایان بۆ هەرێمی

ڕووناکی ئەوان بردووە و ئەم ڕابەرە مەزنانەش بوون بە خوێن و گیانی ئەوان و چەشنی ڕۆحێك لەگەڵیاندا ژیاون. لەو سەردەمانەشدا کە ئەم ئاوەزە بەرزانە لەبیرچوونەتەوە و کەسانێکی خاوەن پایەش پێنەگەیشتوون تا شوێنی ئەوان بگرنەوە، کۆمەڵگا بە هەموو چین و توێژەکانییەوە بێگیان کەوتووە و هزرەکان کۆن بوون و بیری نوێبوونەوەش لەناوچووە.

لە ئێستادا کە ڕۆژان گۆڕاون بە بەهار و سپێدەکانیش یەك بەدوای یەکدا دێن، هەم هیواداریین و هەم لە چاوەڕوانیدایین و هەم لە خوای خۆمان دەپاڕێینەوە ئیرادەیەکمان پێببەخشێت کە بەهۆیەوە بتوانین پەیکەری ڕۆحی خۆمانی پێ بەرزبکەینەوە و، ئیرادەیەکی پشتبەستوو بە مەشیئەتی خواییمان پێ ببەخشێت کە دڵمان بگۆڕێت بە بنارە هەمیشە سەوزەکانی بەهەشت و سینەکانیشمان بگەیەنێت بە نهێنییەکانی حەرەمی ئولوهییەت!.. وە لەسەر شوێنەواری حەزرەتی محەممەد (صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ڕێگای نوێبوونەوە پیشانی نەتەوەکەمان بدات!

داواکردنی ئەمە و چاوەڕێکردنی، هەم مافمانە و هەم ئەرکمانە و هەم یەکێکە لە داخوازییەکانی ئیمانیشمان. بەڵام پێویستە کاتێك ئەم مافە بەکاردەهێنین و ئەم ئەرکە جێبەجێ دەکەین، زوو زوو پرس و ڕا بە ڕابردووی شکۆدارمان بکەین و پەنا بۆ ئەو بەهایانە ببەین کە دوێنێی ئێمەیان بەرز و بەنرخ کردبوو. کاتێك ڕۆژئاوا نوێبوونەوەیەکی لەم جۆرەی بەرپاکرد و بەرەو شارستانێتیی ئەم ڕۆژگارە هەنگاوی نا، پەنای بۆ مەسیحییەت برد و یۆنانی کۆنی وەك نموونەیەك وەرگرت و لەگەڵ ڕۆمای کۆنیشدا هاوسەرگیری کرد. ئەم کۆمەڵە بناغە و دەستوورانە بۆ هەر شارستانێتییەکی تر و لە هەر کاتێکی تردا بێت دەگونجێت.

کەوایە ئێمەش هانا بۆ ڕابردووی خۆمان و ڕەگی مانای خۆمان دەبەین و نموونە و مۆدێلەکانمان لە فراوانییەکانی ئەو لاهووتە دەردێنین کە کات نەیتوانیوە لێڵی بکات. هەر لە بیری فەلسەفییەوە هەتا حەقیقەتی تەسەووف، لەو تێگەیشتنە بەربڵاوەی کە دەربارەی دین هەیە هەتا ڕەهەندە ئەخلاقییەکەی، هەریەکەیان وەك قەنەواچەیەك لەو سەردەمە زێڕینانەوە دێن کە ئێمە هەمیشە بە سەربەرزییەوە یادیان دەکەینەوە و سەبارەت بە ئێمە وەك چەرخی ئاڵتوونیی وان. ئا بەم شێوەیە و لەسەر ئەمانە تاڵ تاڵ نەخشی ئایندەمان دەچنین. لەم چنراوەدا مەولانا و تەفتازانی دێنە پاڵ یەك و، یونس ئەمرە و مەخدوم کوڵو لەسەر یەك بەرماڵ دادەنیشن و، فوزولی، عاکیف لەباوەش دەگرێت و، ئولوغ بەگ سڵاو لە ئەبوحەنیفە دەکات و، دەححانی لەسەر ئەژنۆ لە خزمەتی ئیمامی غەزالیدا دەبێت و، محێدینی عەرەبی گوڵ لە ئیبن سینا دەگرێت و، ئیمامی ڕەببانیش بە مژدەکانی بەدیعوززەمان دەخرۆشێت.. وە ڕابردوویەکی یەکجار مەزن بە خۆی و هزرە گەورە و باڵە بەرزەکانییەوە دێنە تەنیشت یەك و سیحری ڕزگاربوون و زیندووبوونەوە بە گوێماندا دەچپێنن...

ئەوەندە هەیە بتوانین ئەو هەست و بیر و میتۆد و فەلسەفەیە و ئەو شێوازە نەمر و ئاسمانییە بدۆزینەوە کە دەتوانێت هەموو ئەمانە کۆبکاتەوە و بیانخاتە ڕیزی یەك! لەم ڕووەوە بەڕای من پێویستە پێش لە هەر شتێکی تر جارێکی دی چاو بەو ڕێگایەدا بخشێنرێتەوە کە بڕیارە پێیدا بڕۆین و دەبێت سەرلەنوێ جێگیر بکرێت. بناغە گرنگەکانی ڕێنیسانسی ئێمە بریتین لە: ئیلهام و بەرەکەتی عەشق و شەوق، پتەوی و دامەزراویی ژیری و لۆجیك، ئازادی و خۆیی بوون، ئاسکی و

وردی و قووڵی و تەجریدییەتی هونەر و فەلسەفەکەمان و ئەوەش کە خولگەکەی لۆجیك و ڕۆحەکەشی وەحی بێت.

لەم نوێبوونەوەیەدا زامنی وێڵ نەبوون و ڕێگا ون نەکردن بریتییە لەوەی کە: ڕەزامەندیی خوای گەورە ئامانج و مەبەست بێت و، ڕۆح لە پێش جەستەوە بێت و، نەفس لەژێر بەڕێوەبردنی دڵدا بێت و، خۆشویستنی مرۆڤ و نیشتمان خوویەکی دانەبڕاو بێت لە سروشتمان و، ئەخلاقی بەرز توێشوویەکی گرنگی ڕێگا بێت کە دەستبەرداربوون لێی مەحاڵ بێت و، گەردوون و مرۆڤ و ژیان وەك پەڕاوێکی پڕ لە نهێنی وابن کە هەمیشە لەژێر ڕۆشنایی قورئاندا هەموو گۆشەیەکیان بپشکنرێت و، کاراکتەری مرۆڤ هاوڕێ لەگەڵ بەها ڕاستەقینە مرۆییەکانی سەرچاوەیەکی گرنگی بن و، بە ئەندازەی حەققانییەت و پیرۆزیی ئامانج و مەبەستەکان، دەبێت ئەو ئامڕاز و هۆکارانەش کە دەمانگەیەنن پێیان لە خولگەی قورئان و سوننەتدا بن.

لە بنەڕەتدا ئەم خەمخۆرییە بۆ داهاتووی مرۆڤی خۆمان و هەوڵدان بۆ گۆڕینی چارەنووسمان کە ماوەی چەند سەدەیەکە ئاوەژوو بووەتەوە، وەك ڕەچەتەی ڕزگاربوونمان وایە و چەشنی هەڵدانەوەی لاپەڕەیەکی تازە و نوێیە سەبارەت بە نەتەوەکەمان. ئەمانەش بریتین لە چەند بناغەیەك بۆ ئەو خەونی شارستانێتی و نوێبوونەوەیەی کە یوتۆپیاکانیشی تێپەڕاندووە...

لە بەشی ئایندەدا یەك بە یەك لەسەر ئەم بناغانە دەوەستین.

## کاتێک پەیکەری ڕۆحمان بنیات دەنێین

پێشتر بەکورتی ئاماژەمان بە تایبەتمەندییەکانی میراتگرانی زەوی کرد. هەنووکە دەخوازین زیاتر لەسەر ئەو خەسڵەتانە بوەستین و ڕوونیان بکەینەوە. یەکەم تایبەتمەندیی میراتگر ئەوەیە کە "مرۆڤی کامڵ"ە. قورئانی پیرۆز "ئیمان بە خوا" بە بنەمای ئاسۆی مەعریفەت و ئامانجی بەدیهاتنی مرۆڤ و ڕۆحی خۆشەویستی و ڕەهەندی عەشق و شەوق و چێژە ڕۆحانییەکان دادەنێت. مرۆڤ لێپرسراوە لە بنیاتنانی دنیای ئیمان و هزری خۆی بەوەی کە گاهـ لە خودی خۆیەوە ڕێگا لێبدات بەرەو قووڵاییەکانی بوون و، گاهیش پارچە جیاوازەکانی بوون وەربگرێت و لە خۆیدا هەڵیانبسەنگێنێت و سوودیان لێ وەربگرێت. ئەمەش لە هەمان کاتدا مانای دەرکەوتنی ئەو حەقیقەتی مرۆڤێتییەیە کە لە ڕۆحیدا حەشاردراوە. بەڵێ، مرۆڤ تەنها بە ڕووناکیی ئیمان دەتوانێت هەست بە ناخی خۆی و قووڵاییەکانی ناوەوەی و ئامانج و مەبەستەکانی بەدیهاتن و دیوی ناوەوەی ڕووداوەکان و ئەودیو پەردەی بوونەوەران بکات و لە

ڕەهەندەکانی بوون تێبگات. بێباوەڕی سیستەمێکی بنبەست و خنکێنەرە. لە دیدی بێباوەڕدا جیهان بە هەڕەمەکی دەستی پێکردووە و لەنێو چنگی ڕێکەوتە نادیار و ترسناکەکاندا گەشەی کردووە و بەخێراییش ڕووەو کۆتاییەکی مەترسیدار دەخلیسکێت. لەم ڕۆیشتنە نارێك و لەرزۆکەدا نە نەفەسێکی ڕەحمانی هەیە کە ئاسوودەیی بە ڕۆح ببەخشێت و نە جێگایەکی بچکۆلانەش هەیە کە تیایدا شەماڵی ئارامیی خۆمان و ئاواتە مرۆییەکانمان باوەش بکات و نە تەنانەت زەمینێکیش کە بتوانین بەدڵنیاییی پێمانی لەسەر دابنێین.

هەرچی مرۆڤی ئیمانداریشە کە سەرەتا و ئاراستەی جووڵە و ئەو شت و شوێنە دەزانێت کە بۆی ئاراستە کراوە و لە ئەرك و بەرپرسیارێتییەکانی تێدەگات، هەموو شتێك بە ڕۆشنی دەبینێت و دوور لە ترس و ئەندێشە پێ لە زەوی دەنێت و بەوپەڕی چاونەترسی و دڵنیاییەوە بەرەو ئەو ئامانجە دەڕوات کە بۆی دانراوە.. لەم ڕۆیشتنەشیدا هەزاران جار گۆشە و سووچەکانی بوون و ئەودیو پەردەی بوون دەپشکنێت و هەزاران کەڕەتیش بوونەوەران و ڕووداوەکان لە بێژنگ دەدات و پاڵ بە هەموو دەرگایەکەوە دەنێت و بەدوای ڕێگاکانی پەیوەندی بەستندا دەگەڕێت لەگەڵ هەموو تەنێکدا.. لەو جێگایانەشدا کە ئەو شتانەی دەیزانێت و چنگی کەوتووە بەش ناکەن، قەناعەت بەو حەقیقەتانە دەکات کە هەتا ئەو کاتە لە ڕوخساری ئەو لێکۆڵینەوانە و دۆزینەوانەدا بینیونی و بیستوونی، جا چ خۆی کردبێتی یان لەلایەن کەسانی ترەوە ئەنجام درابن. پاشان لەسەر ڕۆیشتنی خۆی بەردەوام دەبێت.

لەم چوارچێوەیەدا گەشتیاری ئیمان سەرچاوەیەکی زۆر گرنگی

هێزی دەست کەوتووە. بەڵێ، ئەم گەنجینە و جبەخانەیەی کە سەر بە جیهانی ئەودیوە و بە "لا حول ولا قوة الا بالله" گوزارشتی لێدەکرێت، سەرچاوەیەکی هێندە گرنگی هێزە کە ئیدی مرۆڤ پێویستی بە هیچ سەرچاوەیەکی تر نامێنێت. ئیماندار هەمیشە "ئەو" دەبینێت و "ئەو" دەناسێت و بەرەو "ئەو" ڕادەکات و ڕەزامەندیی "ئەو" دەکات بە مەبەستی ژیانی و بە ئەندازەی ناسین و متمانە هەبوون بە ئەو دەتوانێت سنگ لە سەرجەم هێزە دنیاییەکان دەربپەڕێنێت، هەربۆیە بە ئومێدی سەرکەوتن بەسەر هەموو کێشەیەکدا و تەنانەت لە نالەبارترین دۆخەکانیشدا بە شەوقەوە دەژی و هەرگیز دووچاری بەدبینی و ڕەشبینی نابێت.

لەبەرئەوەی ئەم بابەتە بووە بە باسی سەرەکیی سەرجەمی پەیامەکانی نوور و دنیایەك بەرهەمی تریش، ئەوا لێرەدا بەمەندە وازدەهێنین و خوێنەری بەڕێز بۆ لای ئەو سەرچاوانە ڕەوانە دەکەین.

دووهەم تایبەتمەندیی میراتگر و گرنگترین ئیکسیری زیندووبوونەوە "عەشق"ە. ئەو مرۆڤەی کە دڵی بە ئیمان بە خوا و ناسینی ئەو نۆژەن کردووەتەوە، بە ئەندازەی باوەڕەکەی هەست بە خۆشەویستییەکی قووڵ و عەشقێکی فراوان دەکات بەرامبەر بە هەموو مرۆڤەکان و تەنانەت هەموو بوونەوەران. بەم شێوەیە هەموو تەمەنی لە ناوەندی عەشق و شەوق و جەزبە و حاڵ و خۆشەویستییەکدا بەسەردەبات کە سەرجەمی بوون لەباوەش دەگرێت. بە مەبەستی بەرپاکردنی زیندووبوونەوەیەکی مەزنی لەم جۆرە، چەشنی هەموو نوێبوونەوەکانی تر، پێویستە هاوڕێ لەگەڵ تێگەیشتنێکی نوێ، دڵەکان بە عەشق بجۆشێن و بە شەوقیش بخرۆشێن. چونکە بەبێ عەشق مەحاڵە هیچ هەڵمەت و هیچ جووڵەیەك بە پایان

بگات و بەرهەمی هەبێت. بە تایبەت ئەگەر ئەم هەڵمەت و جووڵەیە خاوەنی ڕەهەندی عوقبایی بێت.. دەتوانرێت ئەو عەشقە ئیلاهییەی کە سەرچاوەیەکی هێزی بێسنوور و ڕازئامێزە ئەم چوارچێوەیەی بۆ بکێشرێت: دۆزینەوەی پێگەیەك بۆ خۆمان لەنێوان ئەو پەیوەندییانەدا کە لەگەڵ خوای گەورەدا دەبەسترێن، هەست کردن بە چێژی بەدیهاتن لەو ڕووەوە کە بوونی ئێمە سێبەری نووری بوونی ئەوە، قبووڵکردنی ڕەزامەندیی ئەو بە ئامانجی بەدیهاتن و هەوڵدانی هەمیشەیی بۆ دەستخستنی. دەبێت میراتگرانی زەوی ئەم سەرچاوەیە فەرامۆش نەکەن. ڕۆژئاوا، عەشقی لە ڕێگەی ڕەهەندە ماددییەکانی و لە پشت سەری فەیلەسووفەکان و لە هەرێمی پڕ لە تەم و غوباری فەلسەفەدا ناسی و تامی کرد و لە دەرەنجامیشدا بەدرێژایی ڕێگا دووچاری گومان و دوودڵی بوو. ئێمە بە چاویلکەی قورئان و سوننەت تەماشای بوون و سەرچاوەی بوون دەکەین و ئەو عەشق و خۆشەویستییەش کە تاوی سەندووە لە هەناوماندا بەرامبەر بە بەدیهێنەر و ئەو پەیوەندی و خۆشەویستییەش کە لەبەر خاتری ئەو بەرامبەر بە سەرجەمی بەدیهاتووان هەمانە، بە دەستووره هاوسەنگی پارێزەکانی ئەم دوو سەرچاوەیە و فراوانییەکەی کە کراوەیە بەڕووی مێتافیزیکدا، ڕێکیاندەخەین. چونکە سەرەتای مرۆڤ و پێگەی لە گەردووندا و مەبەست لە بوونی و ئەو ڕێگایەی پێیدا گوزەر دەکات و کۆتایی ڕێگاکەشی لەم دوو سەرچاوەیەدا[1] بەجۆرێك ساز و گونجاوە لەگەڵ بیری مرۆڤ و هەستی مرۆڤ و شعووری مرۆڤ و چاوەڕوانییەکانی مرۆڤدا کە ئەستەمە مرۆڤ بتوانێت لە بەرامبەریەوە سەراسیمە و حەیران نەبێت. ئەم دوو سەرچاوەیە سەبارەت

١. مەبەست لێی قورئان و سوننەتە.

بە پاڵەوانانی ڕۆح، فوارەی عەشق و شەوق و کانگای جەزبە و حاڵن. ئەوانەی بە هەستی پاك و ناسنامەی موحتاجییەوە لەم دەرگایانە دەدەن، دەستیان بە خاڵی ناگەڕێتەوە و ئەوانەش کە پەنایان بۆ دەبەن نەمری چنگی خۆیان دەخەن. ئەوەندە هەیە پێویستە پەنابەران دارای قووڵی و دڵسۆزییەکەی "ئیمامی غەزالی" و "ئیمامی ڕەببانی" و "شاهی وەلی" و "بەدیعوززەمان"بن و خاوەنی هەیەجانێکی وەك "مەولانا" و "شێخ غالیب" و "محەممەد عاکیف" و ئیمان و بزاوتنێکی وەك "خالید" و "عوقبە" و "سەلاحەددین" و "فاتیح" و "یاووز"بن.. بەڵێ، بە تێکەڵکردن و خەرمان کردنی عەشق و شەوقی بەکوڵی ئەمانە کە هەموو کاتەکان و شوێنەکانی گرتووەتەوە لەگەڵ شێواز و میتۆد و ئامڕازەکانی ئەم سەردەمەدا، گەیشتن بە ڕۆحی هەمیشە زیندووی قورئان و لە دەرەنجامیشدا بە مێتافیزیکێکی گەردوونی، دووهەم هەنگاوی ئێمە پێکدەهێنێت.

سێهەم تایبەتمەندیی میراتگر ئەوەیە کە بە یارمەتیی سیانەی ژیری و لۆجیك و شعوور ڕوو لە زانست دەکات. لەکاتێکدا کە مرۆڤایەتی بەشوێن کۆمەڵێك بیردۆزی تاریکدا کێشدەکرێت، ئەم ڕووتێکردنە کە لە هەمان کاتدا وەڵامێکیشە بۆ ئەو مەیلە گشتییەی کە مرۆڤەکان بەرامبەر بە زانست هەیانە، دەبێت بە هەنگاوێکی زۆر گرنگ بۆ ڕزگارکردنی سەرجەمی مرۆڤایەتی. بەڵێ، وەك بەدیعوززەمان ئاماژەی بۆ دەکات: مرۆڤایەتی لە ئاخرزەماندا بە هەموو هێزیەوە ڕوو لە زانست و هونەر دەکات.. هەموو هێزی خۆی لە زانست وەردەگرێت.. دەسەڵات و هێز جارێکی تر دەکەونەوە دەستی زانست.. وە ڕەوانبێژی و ڕەوانگۆیی و شێوازەکانی دەربڕین دەبن بە بابەتێك کە هەموو کەسێك گرنگییان پێ

دەدەن و لە گەیاندنی زانستەکاندا بە کۆمەڵانی خەڵك بەکاردەهێنرێن.. واتە جارێکی تر سەردەمی زانست و ڕەوانبێژی دەژیێتەوە. خۆ هیچ ڕێگایەکی تریش نییە بۆ ڕزگاربوون لەو تەم و غوباری وەهمەی کە چواردەورمانی تەنیوە و بۆ گەیشتن بە ڕاستییەکان و کرۆکی حەقیقەتەکان. بەڵێ، بۆ تێپەڕاندنی ئەو بۆشاییەی کە چەند سەدەیەکە دروستبووە، بۆ گەیشتن بە تێریی مەعریفەت، بۆ نۆژەنکردنەوەی ئەو کاولکارییانەی کە هەستی چەوساوەیی و ژێردەستی لە دەروون و نەستماندا دروستیکردووە، بۆ سەرلەنوێ متمانە پەیداکردن بە خۆمان، دەبێت زانست بە ئاوێزەی بیری ئیسلامیدا تێبپەڕێنین و هەر بەم شێوەیەش دەرببڕرێت و نوێنەرایەتی بکرێت. لە ڕابردووی نزیکماندا لەبەرئەوەی گاهـ ئامانج و ئاڕاستەی زانست نادیار بوو، گاهـ زانست تێکەڵی زانراو، یان زانست تێکەڵی فەلسەفە دەکرا، بێسەروبەرییەکی جددی لە بیری زانستیدا ڕوویدا و پیاوانی زانستیش بەجۆرێك شان و شکۆیان شکا کە نۆژەنکردنەوەی ئەستەم بێت. ئەم بۆشاییەی کە لە وڵاتماندا دروستبوو بە کەڵکی بێگانەکان هات و لە هەموو گۆشەیەکی نیشتمانماندا قوتابخانەیان کردەوە و لە ڕێگەی ئەم لانکەی پەروەردانەوە "بێگانەبوون"یان لە نەوەکانماندا چاند. کۆمەڵێکی ناو ئێمەش، لێهاتووترین ڕۆڵەکانی ئەم نیشتمانەیان، بە هەزار و یەك تکا و دەستماچکردن، لەو خوێندنگایانەدا دانا و ئەوەندەی تر ئەم بێگانەبوونەیان خێراتر کرد. پاش ماوەیەك ئەم نەوە مەغرور و خەڵەتێنراوە نە دینی ما نە ئیمان، دین کاول بوو و ئیمانیش وێران. بۆیە وەکو ئوممەت لە بیرکردنەوە و تەسەوور و هونەر و ژیاندا دووچاری خۆدۆڕاندن و خۆونکردن بووینەوە. جا چۆن وا نابێت، لەو خوێندنگایانەدا کە بێ هیچ دوودڵی و ترسێك

لاوەکانی خۆمان بە ئەمانەت پێ سپاردبوون، بەبێ بواردن، هەمیشە کلتووری ئەمریکی و ئەخلاقی فەرەنسی و دابونەریتی ئینگلیزی لە پێش زانست و بیری زانستییەوە بوو. لەم ڕووەوە گەنجەکانمان لەبری ئەوەی زانست و تەکنیك و تەکنەلۆجیای ڕۆژگاری خۆیان فێربن، بوون بە چەند دەستە و تاقمێکەوە و دەستیان کرد بە گەمەی مارکسی و دۆرکهایمی و لینینی و ماوی. هەندێك بە کۆمیونیزم و دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا (چینی کرێکار) دڵی خۆیان دایەوە.. هەندێك ڕۆیشتن و لە گرێ (Complex)ی فرۆیددا چەقین.. هەندێك دڵیان بە بوونگەری دا و لە سارتەر هەڵنووتین.. هەندێك بەدەم وتنی مارکۆسەوە لیك لە زاریان دەڕژا.. هەندێکیش هەموو تەمەنیان لە پشت سەری وڕێنەکانی کامۆوە بەسەربرد.. بەڵێ، لەم وڵاتانەدا هەموو ئەمانە ڕوویاندا و دایکایەتیی ئەم ڕووداوانەش بەناو قوتابخانەکان کردیان. لەم سەردەمی قەیرانانەدا هەندێك دەنگی ڕەش و زاری ڕەش بەبەردەوامی ئایین و ئاییندارییان تاوانبار دەکرد و هەمیشە سەرشێتییەکانی ڕۆژئاوایان کردبوو بە ویردی سەر زمانیان. بێگومان ئەستەمە ئێمە ئەو سەردەمە و بەکرێگیراوە هەرزانەکانی ئەو ڕۆژگارەمان بیربچێتەوە. ئەوانەی کە دژی نیشتمان و مرۆڤی ئێمە ئەو زەمینەیەیان ڕەخساند، لە ویژانی گشتیدا بە هەمیشەیی وەك تاوانبارانی مێژوویی یاد دەکرێنەوە.

با هەنووکە ئێمە -هاوڕێ لەگەڵ هێڵنجی ناخ و ئازاری دڵمان- ئەم سەردەمە تاریك و ڕابەرانی ئەو ڕۆژگارە، لەگەڵ تاوان و خراپکارییەکانی خۆیاندا بە تەنیا جێبهێڵین، چونکە دەمانەوێت باس لەو کرێکارانەی فیکر بکەین کە داهاتوومان بنیات دەنێن.

بەڵێ، پێویستە لە سایەی چاندنی بیری زانستی لە لاوەکانماندا، هەروەك توانیمان لە ڕابردوودا و چەندین سەدە پێش ڕۆژئاوا ئەنجامی بدەین، تێکەڵاوبوونی ئەوان لەگەڵ زانست و هزردا دەستەبەر بکەین و لەم ڕێیەوە سەرلەنوێ لەدایکبوونەوەکەمان دەهێنینە دی. ئازاری نەهامەتی و کارەساتەکان لە ویژدانی گشتیدا و ئەو ژانەی کە چەندەها ساڵ ژیانی چەوسانەوە و ژێردەستەیی فەراهەمی هێناوە و ئەو پەرچەکردارەی کە لە دەرەنجامی داگیرکاری و خوێنمژینی چەندین ساڵەوە لە مرۆڤی ئێمەدا هێناوییەتە مەیدان، لە ئێستادا ئاخ و فیغانێکی وای لە ئێمەدا دروستکردووە کە هاوتای هاوارەکانی ئادەم و ناڵەکانی یونس و نرکەکانی ئەییوبە. تەنانەت ئێستا بە یارمەتیی هێزی پاڵنەری ئەم هەست و بیرە و بە چاوساغیی ئەزموونە مێژووییەکان، هەست دەکەین کە دوورییەکان چوونەتەوە یەك و چەند هەنگاوێکمان ماوە بۆ ئامانجەکەمان.

چوارەم تایبەتمەندیی میراتگر ئەوەیە کە جارێکی تر و سەرلەنوێ چاو بە تێبینییەکانیدا دەخشێنێتەوە سەبارەت بە گەردوون و مرۆڤ و ژیان و بە یارمەتیی پێوەرێکی ورد، چاك و خراپ لەیەکتر جودا دەکاتەوە. لەم بوارەدا دەتوانین بڵێین:

١. گەردوون کتێبێکی وایە کە لەلایەن خوای گەورەوە و بە مەبەستی موتاڵاکردنی بەردەوام خراوەتە پێش چاو، مرۆڤیش بریتییە لە پێڕستێکی شەفافی هەموو جیهانەکان و ڕوانگەیەکە بۆ سەرنجدان لە قووڵاییەکانی بوون، ژیانیش بەرجەستەبوونی ئەو مانایانەیە کە لەم کتێب و لەم پێڕستەوە دەتکێن و بە فەرمایشتی خوایی دەنگ دەدەنەوە. ئەگەر گەردوون و مرۆڤ و ژیان بریتی بن لە ڕەنگ و ڕووە جیاوازەکانی هەمان حەقیقەت

-کە هەر وایشە- جیاکردنەوەی ئەمانە لە یەکتر، چونکە هەماهەنگیی ناوخۆیی حەقیقەت تێکدەدات، هەم بەرامبەر بە بوون و هەم دەرهەق بە مرۆڤ، ناحەقی و بێڕێزییە.

بەڵێ، هەروەك خوێندنەوە و تێگەیشتن و گوێڕایەڵی و ملکەچی بۆ ئەو فەرمایشتانەی خوای گەورە کە لە سیفەتی کەلامەوە سەرچاوەیان گرتووە واجبە، بە هەمان جۆر سەرجەمی بوونەوەر و ڕووداوەکان کە بە زانستی ئەو نەخشەیان بۆ کێشراوە و بە توانست و ویستەکەشی هاتوونەتە بوون، ناسین و تێگەیشتنی ئەمانە و دیاریکردنی ڕێگاکانی خۆگونجان لەگەڵیاندا، بنەمایەکی وایە کە دەست بەرداربوون لێی مەحاڵە. بەڵێ، قورئانی پیرۆز کە لە سیفەتی گوفتاری ئەوەوە سەرچاوەی گرتووە ڕۆحی هەموو بوون و تاقە سەرچاوەی بەختەوەریی دنیا و عوقبایە و کتێبی بوونەوەرانیش جەستەی ئەم حەقیقەتەیە و لە ڕووی ئەو زانستانەوە کە لە ناویدا دانراوە، دینەمۆیەکی زۆر گرنگی ژیانی دنیایە بە ڕاستەخۆیی و هی عوقبا بە ناڕاستەوخۆیی. هەربۆیە تێگەیشتنی دروست لە هەردوو کتێبەکە و کارکردن پێیان و پاشان چنینی سەرلەبەری ژیان بە گوێرەیان پاداشتی خۆی هەیە و بەپێچەوانەشەوە فەرامۆشکردنیان و بێئاگابوون لێیان و تەنانەت ڕاڤەکردنیان بەشێوەی هەڵە و جێبەجێ نەکردنیان سزای تایبەت بە خۆی هەیە.

٢. هەروەك پێویستە لە هەست و بیر و خورەوشتی مرۆڤدا بەدوای بەها مرۆییە ڕاستەقینەکاندا بگەڕێین، بۆ زانینی شان و شکۆی ئەم بەهایانەش لە لای خوا و لای خەڵکیش دەبێت هەمان ئەم تایبەتمەندییانە بەهەند وەربگیرێن. تایبەتمەندییە بەرزە مرۆییەکان و قووڵیی بیر و

پتەویی کەسایەتی وەك چەکێکی بانك وایە کە لە هەموو جێگایەك کاری پێدەکرێت. ئەو مرۆڤەی کە سیفەت و بیری کافرانەی تێکەڵاوی ئیمانەکەی کردووە و هەمیشە بە کەسایەتییەکەشی ترس و ئەندێشە لە چواردەوریدا دروست دەکات، هەروەك هەرگیز چاودێری و پشتگیریی خوایی بەنسیب نابێت، بە هەمان جۆر ئەستەمە شکۆ و متمانەی خۆی لای خەڵکیش بپارێزێت. چونکە خوا و خەڵکیش تایبەتمەندی و کەسایەتیی مرۆڤەکان هەڵدەسەنگێنن و بەو پێیەش خەڵاتیان دەکەن. هەربۆیە ئەو کەسانەی کە لە ڕووی بەها مرۆییەکانەوە هەژار و کەسایەتییان لاوازە، ئەگەر شێوەیان وەك ئیماندارێکی باشیش بێتە بەر چاو، ئەستەمە بتوانن سەرکەوتنی گەورە بەدەست بهێنن و ئەو سەرکەوتنانەش بپارێزن کە چنگیان کەوتووە. بەپێچەوانەشەوە ئەوانەی کە هەرچەندە شێوەیان لە موسڵمانێکی زۆر باش ناچێت، بەڵام کەسایەتییان بەهێزە و لە ڕوانگەی سیفەتە بەرزە مرۆییەکانەوە چەند هەنگاوێك لە پێشترن، زۆر ئەستەمە سەرنەکەون. بەڵێ، هەروەك نرخاندن و خەڵاتی خوایی بەگوێرەی سیفەت و تایبەتمەندییەکانە، تا ڕادەیەك ڕووتێکردن و قبووڵکردنی خەڵکیش هەر پەیوەندیی بەمەوە هەیە.

٣. بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی حەق و ڕێگەپێدراو پێویستە ئامراز و هۆکارەکانیش وەك خۆی حەق و ڕێگەپێدراو بن. بەڵێ، واجبە لەسەر ئەوانەی کە لەسەر هێڵی ئیسلامن هەموو مەبەست و خەیاڵ و ئامانجێکیان حەق و ڕێگەپێدراو بێت و ئەو هۆکارانەش کە دەیگرنە بەر حەق و مەشروع بن. هەروەك بەبێ ئیخلاس و دڵسۆزی ڕەزامەندیی خوا و گەیشتن بە خوا مەیسەر نابێت، خزمەتکردنی ئیسلام

و ئاراستەکردنی موسڵمانانیش بۆ ئامانجە ڕاستەقینەکانیان هەرگیز لە ڕێگە شەیتانییەکانەوە نایەتەدی. تەنانەت ئەگەر هەندێك جار پێچەوانەی ئەمەش وەك گونجاوێك دەربکەوێت، ئەو کەسانەی کە لە ڕێگا چەوتەکاندا شان و شکۆی خۆیان دۆڕاندووە و ئاورلێدانەوەی خوا و ڕووتێکردنی خەڵکیان لەدەست داوە، هەرگیز ناتوانن بۆ ماوەیەکی درێژ سەرکەوتوو ببن.

پێنجەم تایبەتمەندیی میراتگر ئەوەیە کە ئازادانە بیردەکاتەوە و ڕێز لە ئازادی بیر و ڕا دەگرێت. ئازادبوون و هەست کردن بە ئازادی ڕەهەندێکی قووڵ و گرنگی ئیرادەی مرۆڤە و دەرگایەکی ڕازئامێزی وایە کە بەڕووی نهێنییەکانی کەسایەتیدا دەکرێتەوە. کەسێك کە ئەو قووڵییەی بەدەست نەهێناوە و بەو دەرگایەدا تێنەپەڕیوە، ناونانی بە مرۆڤ کارێکی ئێجگار سەختە. وا بۆ چەندین ساڵی ڕەبەق دەچێت کە ئێمە هەم لە ناوەوە و هەم لە دەرەوە لەنێو چنگ و ددانی ترسناکی دەستبەسەری و دیلێتیدا دەناڵێنین. لە دیلێتییەکدا کە فشاری جۆراوجۆر لە هەست و بیرکردنەوەکانمان دەکرێت.. لە هەرێمی لەم شێوەیەدا کە هەڕەشە لە خوێندنەوە و بیرکردنەوە و هەستکردن و ژیان دەکرێت، ئەستەمە مرۆڤ بتوانێت بە مەلەکە مرۆییەکانەوە بمێنێتەوە، چ جای ئەوەی بگات بە نوێبوونەوە و پێشکەوتن.

بەڵێ، پێدەچێت لە زەمینەیەکی لەم شێوەیەدا نەك هەر مرۆڤگەلێکی مەزنی وا پێنەگەن کە بە ڕۆحی نوێبوونەوە شاباڵیان گرتبێت و چاویان لە ئەبەدییەت بڕیبێت، بەڵکو پاراستنی کەسەکان لە ئاستی مرۆڤی سادە و ساویلکەشدا تابلێی سەخت و گرانە. لە مەیدانێکی هاوشێوەی

ئەمەدا هەبێت و نەبێت کەسانێکی خاوەن کەسایەتیی لاوازی لەڕێ لادەر و ڕۆحی بەزیو گۆش دەبن کە هەستەکانیان ئیفلیج بووە. لە ڕابردووی نزیکماندا هەم خێزان و هەم شەقام و هەم دەزگاکانی پەروەردە و فێرکردن و هەم ناوەندە هونەرییەکان بیری سەقەت و پێوەری لاری وایان لە ڕۆحمان ئاخنی کە هەموو شتێکمانی هەر لە ماددەوە هەتا ڕۆح و هەر لە فیزیکەوە هەتا میتافیزیك سەروژێر کرد. لەم ڕۆژگارەدا کاتێك دەمانویست بیربکەینەوە لادانەکانی خۆمان ئاشکرا دەکرد و نەخشەی هەموو شتێکمان بەگوێرەی منێتیی خۆمان دەکێشا و هەرگیز ئەوەمان بەخەیاڵدا نەدەهات کە بێجگە لە تێگەیشتن و باوەڕی خۆمان دەگونجێت تێگەیشتن و باوەڕی تریش هەبێت و هەلمان بۆ بڕەخسایە زوو زوو هانامان بۆ هێز دەبرد و لە ڕێگەی بەکارهێنانی هێزیشەوە مشتمان لە دەمی حەق و ئیرادە و بیرکردنەوەی ئازاد دەکوتی و ئەوانی دیمان دەچەوساندەوە. چەند تاڵە ئەوەی کە تەنانەت ئێستاش ناتوانین بڵێین ئەم جۆرە شتانە نەماون یان لە داهاتوودا نامێنن. ئەمە لە حاڵێکدا کاتێك وەکو ئوممەت بەرەو نوێبوونەوە هەنگاو دەنێین، پێویستە لە لایەك جارێکی تر چاو بە دینامیك و پاڵنەرە مێژووییەکانی هەزار ساڵەماندا بخشێنینەوە و لە لایەکی تریشەوە دەبێت ڕەخنە لەو "گۆڕان"انە بگرینەوە کە لە سەد و پەنجا ساڵی ڕابردوودا ڕوویاندا. چونکە بەداخەوە لەمڕۆماندا بڕیارەکان بەگوێرەی کۆمەڵێك دەردەکرێن. ئەو بڕیارانەش کە لەژێر کاریگەریی وەها بیرکردنەوەیەکدا دەردەکرێن ناتەواو و نەخۆشن و هیچیان لێ سەوز نابێت.. وە هەرگیز ئەو سەردەمە ڕووناکە ناهێنێتە دی کە چاوەڕێ دەکرێت. بەپێی ئەم تێگەیشتنەی حاڵی حازر، هەبێت و نەبێت،

تەنها پێکدادانی نێوان چینەکان کە لە تۆڕی هەڵپە و تەماعدا گیریان خواردووە و شەڕەشۆقی نێوان پارتە سیاسییەکان و شەڕی نێوان نەتەوەکان و سەرکەشیی نێوان هێزەکان، پەیدادەبێت. ئەمڕۆ هۆکاری پێکدادانی کۆمەڵێك لەگەڵ یەکێکی تردا ئەمەیە و هۆی گۆڕانی جیاوازییەکان بۆ ئامرازێك بۆ شەڕ هەر ئەمەیە و سەرچاوەی ئەو دڕندەییەی سەر زەویش کە هەر تەواو نابێت هۆکارەکەی هەر ئەمەیە. ئەگەر مرۆڤەکان هێندە خۆپەرست و هێندە هەڵپەکار و هێندە بێبەزەیی نەبوونایە، لەوانەیە ئێستا دنیا وێنەیەکی جیاوازتری هەبووایە.

کەوایە کاتێك ئەمڕۆ بەرەو دنیایەکی جیاواز هەنگاو دەنێین، هەم لە ڕەفتارماندا بەرامبەر بەوانی دی و هەم بەرامبەر بە منێتی و هەڵپەکانی خۆمان، پێویستە ئازادانەتر بیربکەینەوە و ئازادانەتر بڕیاربدەین.. بەڵێ، ئەمڕۆ زیاتر لە هەموو شتێکی تر پێویستمان بە سینەگەلێکی فراوانی وا هەیە کە بیرکردنەوەی ئازاد لەباوەش بگرن و کراوە بن بەڕووی زانست و بیری زانستیدا و لەسەر ئەو هێڵەی کە لە گەردوونەوە بەرەو ژیان درێژدەبێتەوە هەست بە گونجانی نێوان قورئان و یاسا خواییەکانی ناو سروشت بکەن. ئەمەش لە ئێستادا تەنها کۆمەڵێك دەتوانن پێی هەستن کە ئەرکی بلیمەتی (دهاء) لەسەر شانیان نراوە. ئەوەی ڕاستی بێت جاران ئەم کارە مەزنانە لە ڕێگەی بلیمەتییە شەخسییەکانەوە نوێنەرایەتی دەکران.. بەڵام لەم ڕۆژگارەدا کە هەموو بوارێك بووە بە پسپۆڕی و دنیا شێوەیەکی وای وەرگرتووە کە زیرەکترین بلیمەتەکانیش ناتوانن لەژێر باری دەربچن، ئیدی کەسێتیی مەعنەوی و ڕاوێژ و شعووری دەستەجەمعی جێگەی بلیمەتی گرتووەتەوە و ئەمەش پوختەی شەشەم تایبەتمەندی میراتگرانی زەوییە.

ئەوە ڕاستییە كە لە ڕابردووی نزیكماندا تێگەیشتنێكی لەم جۆرە نەكراوە بە ماڵی كۆمەڵگەی موسڵمان.. خۆی لە خۆیدا لە سەردەمێكدا كە خوێندنگە تەنها چەند دۆگمایەكی دووپات دەكردەوە و قوتابخانەی ئایینیش كە تەنها گرنگی بە كەنار و گۆشەیەكی ژیان دەدا و تەكیەش كە تەنها لە مێتافیزیكدا چەقیبوو و سەربازگەش كە تەنها هێزی كردبوو بە پێوەر و لەو ڕێیەوە دەینەڕاند.. بەڵێ، لەم حاڵەدا مەحاڵ بوو بتوانرێت جێیەك لەژیانی ئاساییدا بۆ ئەمانە بكرێتەوە.

بەڵێ، لەم سەردەمەدا خوێندنگا بەتەواوەتی چووە ژێر كاریگەریی بیری سكۆلاستیكی (Scolastique)[1] و هەردەم ئەوی هەڵمژی و قوتابخانەی ئایینیش داخراوبوو بەڕووی زانست و بیركردنەوەدا و مەحرووم بوو لە هێزی داهێنان و وەك بڵێی ژیانێكی ئیفلیجانەی بەڕێ دەكرد.. زاویە و تەكیەش لەبری عەشق و شەوق دڵی خۆی بە سەرگوزەشتە و بەسەرهاتی پێشینەكان دەدایەوە.. ئەوانەش كە نوێنەرایەتیی هێزیان دەكرد، زوو زوو ئەندێشە و ترسی لەبیركران دایدەگرتن و تووشی گرفتێكی دەروونیی وا دەبوون كە خۆیان بەناچار دەزانی خۆیان بسەلمێنن و خۆیان بیری كەسانی تر بخەنەوە. لە ئەنجامی هەموو ئەمانەدا هەموو شتێك ئاوەژوو بووەوە و درەختی ئوممەت بەجۆرێك لەرزی كە زۆری نەمابوو بێت بە لادا. وا دیارە ئەم هەژان و لەرزینە بەردەوام دەبێت هەتا ئەو كاتەی ئەو بەختیارانەی كە قەدەر گوڵی لەسەر ڕێیان چاندووە، ئەم دینامیكانە لە شوێنی دروستی خۆیاندا بەكاردەهێنن و ئەو چەقبەستنەی نێوان دڵ و ژیری دەكەنەوە و لە نەفسی مرۆڤەكاندا ڕاڕەوی بیر و ئیلهام لێ دەدەن.

[1] ١. سكۆلاستیك بە مانای باوەڕهێنان و شوێنكەوتنی كوێرانەی بیروباوەڕێك دێت و دژی هەموو جۆرە بیركردنەوەیەكی ئازادە.

حەوتەم تایبەتمەندیی میراتگرانی زەوی بیری ماتماتیکییە. سەردەمانێك پێشینەکانی ئاسیا و پاشان ڕۆژئاوا توانییان لە سایەی بیرکردنەوە بە یاسا ماتماتیکییەکان ڕێنیسانس بهێننە دی. مرۆڤایەتی بەدرێژایی مێژوو زۆر شتی نادیار و تاریکی لە دنیای ڕازئامێزی ژمارەکاندا دۆزیوەتەوە و هێناویەتە مەیدان. بێجگە لە ڕەفتاری زیادەڕەوانەی حروفییەکان[1]، ئەستەمە بەبێ ماتماتیك بتوانین نە لە بوونەوەران و نە لە پەیوەندیی نێوان مرۆڤەکان تێبگەین. ماتماتیك، چەشنی سەرچاوەی ڕووناکییەك کە گەردوون و ژیان دەگرێتەوە، ڕێگامان ڕووناك دەکاتەوە و ئەودیوی ئاسۆی مرۆڤ و تەنانەت ئەو قووڵاییانەی جیهانی مومکیناتمان پیشان دەدات کە بیرکردنەوە و تێگەیشتن لێیان زۆر سەختە و لەگەڵ ئامانجە باڵاکانماندا دەمانگەیەنێت بە یەك.

ئەوەندە هەیە ڕیازی بوون مانای ئەوە نییە تەنها ئەو شتانە بزانین کە پەیوەندی بە ماتماتیکەوە هەیە. بەڵکو بریتییە لەوەی بە یارمەتیی یاساکانی ماتماتیك بیربکەینەوە و لە ڕێگای دوور و درێژی بیری مرۆڤ هەتا قووڵاییەکانی بوون لەگەڵیدا بین. لە فیزیکەوە تا مێتافیزیك، لە ماددەوە تا وزە، لە جەستەوە تا ڕۆح، لە یاساوە تا تەسەووف هەمیشە و بەردەوام هاودەمی بین. بەڵێ، ئێمە ناچارین بۆ تێگەیشتن لە بوون، شێوازی دوانەی بیری تەسەووفی و لێکۆڵینەوەی زانستی بەکاربهێنین. ڕۆژئاوا زەحمەتێکی زۆری کێشا بۆ پڕکردنەوەی جێگای ئەو جەوهەرەی کە لە بنەڕەتدا نەیبوو و هەوڵی دا تا ڕادەیەك

---

١. حروفییەکان بریتین لەو کەسانەی کە گرنگی بە تایبەتمەندیی پیتەکان دەدەن و کۆمەڵێك مانای نهێنی و ئاشکرایان دەخەنەپاڵ و زۆرجار شێوەی خورافە لەخۆدەگرێت.

ئەم پێویستییە بە میستیسیزم (Mysticism)[١] پڕبکاتەوە.. دنیای ئێمە کە هەمیشە لەگەڵ ڕۆحی ئیسلامدا ئاوێزان بووە، پێویستمان بەوە نییە بەدوای هەر شتێکی تری بێگانەدا بگەڕێین یان پەنای بۆ بەرین. ئێمە هەموو سەرچاوەکانی هێزمان لە بیر و سیستەمی ئیمانیدایە، بەڵام بەو مەرجەی لەو کانیاو و لەو ڕۆحە بەجۆرێك تێبگەین وەك دەوڵەمەندییەکەی یەکەم جاری.. ئیدی ئەوکات هەندێك لە پەیوەندییە ڕازئامێزەکانی ناو بوون و هەماهەنگی و گونجانی ئەم پەیوەندییانە لەگەڵ یەکتردا دەبینین و هەموو شتێك بە جۆرێکی جیاوازتر دەبینین و دەگەین بە چێژی عیرفانی.

پاش پێشکەش کردنی پوختەیەك لەسەر بیری ماتماتیکی کە لە ئێستادا بە شتێکی ئاڵۆز و زیادەڕەوی لە وتندا دادەنرێت، بەڵام باوەڕم وایە لە داهاتوودا دەنگدانەوەی مەزنی دەبێت، دەبوو "بیری هونەری" وەکو تایبەتمەندیی هەشتەم تاوتوێ بکەین. بەڵام هەنووکە لەسەر بنەمای هەندێك نهێنی و تێبینی، وەکو ژولیڤێرن، دەڵێین "هەندێك کەس لە چوارچێوەی پێوەرەکانی ئێمەدا هێشتا ئامادە نین بۆ گەشتێکی لەم شێوەیە." و بەم جۆرە موتاڵاکەمان کۆتایی پێ دەهێنین.

١. بریتییە لە ڕێبازێکی فەلسەفی کە گرنگی بە نهێنی ڕووداوە نائاساییەکان دەدات و زیاتر خۆی بە مەجاز و خورافەکانەوە سەرقاڵدەکات.

## شورا

شورا، بە هەمان شێوەی میراتگرانی یەکەم، سەبارەت بە میراتگرانی ئەمڕۆش زیندووترین تایبەتمەندی و پتەوترین یاسایە. بەگوێرەی قورئان، شورا دیارترین نیشانەی کۆمەڵگەیەکی ئیماندار و گرنگترین خەسڵەتی ئەو کۆمەڵانەیە کە دڵیان بە ئیسلام داوە. شورا لە قورئانی پیرۆزدا لەگەڵ هەمان ڕاستەهێڵی نوێژ و بەخشیندا باس کراوە.

﴿ وَالَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ
وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ ﴾

(الشورى: ٣٨)

"ئەوانەش بەدەم بانگەوازی پەروەردگاریانەوە چوون و نوێژەکانیان بەچاکی ئەنجام داوە و کاروباریان هەردەم بە مەشورەت و ڕاپرسی و ڕاوێژکارییە، لەو ڕزق و ڕۆزیەی کە پێمان داون، دەبەخشن."

بەم جۆرەش یادمان دەخاتەوە کە شورا ڕەفتارێکە لە ئاستی عیبادەتدا. بەڵێ، لەم فەرمانە خواییەدا باس لە وەڵامدانەوەی بانگەوازی خوا و

پێویستی و ئەنجامی ئەم وەڵامدانەوەیەش کە نوێژ و شورا و بەخشینە، کراوە. لەم ڕێگایەشەوە گرنگی بابەتەکە پێش چاو خراوە.

هەر لەبەر ئەم هۆیەیە کە هەروەك ئەو کۆمەڵگایەی گرنگی بە شورا نادات بە ئیمانداری تەواو ئەژمار ناکرێت، بە هەمان جۆر ئەو کۆمەڵەیەش کە جێبەجێی ناکەن وەکو موسڵمانی کامڵ قبووڵ ناکرێن. شورا لە دینی ئیسلامدا بناغەیەکی ئەوەندە گرنگە کە پێویستە هەم بەڕێوەبەران و هەم بەڕێوەبراوان بێ چەند و چۆن ملی بۆ بدەن. بەڕێوەبەران ڕاوێژ کردن لەسەر سیاسەت و بەڕێوەبردن و یاسادانان و چەندین بابەتی تری پەیوەندیدار بە کۆمەڵگا و بەڕێوەبراوانیش لەسەر گەیاندنی بیر و ڕای خۆیان بە بەڕێوەبەران، ڕاسپێردراون.

پێش لە هەر شتێکی دی شورا یەکەم مەرجی ڕاستبوون و پێکانی هەر بڕیارێکە لە هەر بوارێکدا بدرێت. ئەو بڕیارانەی کە تایبەت بە تاك و کۆمەڵگا دەردەکرێن، ئەگەر بەباشی بیریان لێ نەکرێتەوە و ڕا و سەرنج و ڕەخنەی کەسانی تری لەسەر وەرنەگیرێت، زۆر جار بە نوشوست و دۆڕان کۆتایی پێ دێت. کەسێك کە داخراوە بەڕووی بیرکردنەوەکانی خۆیدا و ڕێزی ڕای کەسانی تریش ناگرێت، ئەگەر خاوەنی سروشتێکی مەزن و بیرکردنەوەیەکی باڵا و تەنانەت بلیمەتیش بێت، زیاتر دووچاری بەهەڵەداچوون دەبێت وەك لە کەسێکی سادە و ئاسایی کە لە هەموو ڕەفتارێکیدا ڕاوێژ بە کەسانی تر دەکات. ژیرترین مرۆڤ ئەو کەسەیە کە لە هەموو کەس زیاتر ڕێز لە ڕاوێژ دەگرێت و زۆرترین سوود لە ڕا و پێشنیاری خەڵك وەردەگرێت. ئەوانەی کە لە کار و نەخشەکانیاندا بە بیر و هزری خۆیان قەناعەت دەکەن و تەنانەت هەوڵ دەدەن بە زۆر

بیسەپێنن بەسەر کەسانی تریشدا، هەروەك دینەمۆیەکی زۆر گرنگیان لە کیسی خۆیان داوە، بە هەمان جۆر هەردەم ڕووبەڕووی نەفرەت و بێزی چواردەوریشیان دەبنەوە.

بەڵێ، هەروەك یەکەم مەرجی گەیشتن بە جوانترین ئەنجام لە هەر کارێکدا کە مرۆڤ دەستی دەداتێ ڕاوێژکردنە، بەهەمان جۆر ڕێگای گەیشتن بە سەرچاوەی هێزێکی وا کە چەندین جار لە سەروو ئاست و وزەی شەخسیی تاکەوەیە، جگە لە ڕاوێژ هیچ شتێکی تر نییە.

بەڵێ، پێویستە پێش دەستکردن بە هەر کارێك، هەموو جۆرە پرس و ڕاوێژ و لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونێك ئەنجام بدرێت و لە بازنەی هۆکارەکاندا هیچ شتێك فەرامۆش نەکرێت، تا لە ئەنجامدا ڕەفتاری زیانبەخشی وەك ڕەخنە گرتن لە قەدەر و تاوانبارکردنی دەوروبەر ڕوونەدات، کە ئەمانە لە خۆیاندا بەلا و موسیبەتەکە دووقات دەکەن.. بەڵێ، ئەگەر پێش نییەت هێنان لە هەر کارێك سەرەتا بەجوانی بیر لە دەرەنجامەکەی نەکرێتەوە و پرس و ڕاوێژ بە کەسانی خاوەن زانست و ئەزموون نەکرێت، بێگومان کۆتاییەکەی نائومێدی و پەشیمانی دەبێت. زۆر کاروبار هەن لەوانەی کە بیر لە پێش و دوایان نەکراوەتەوە، جگە لەوەی کە دوو هەنگاو نەبراونەتە پێش، بەڵکو بوون بە هۆکاری دۆڕانی ناوبانگ و شان و شکۆ و خەیاڵ شکان و نائومێدبوونی خاوەنەکانیان.

شورا لە سەرەتای ئەو دینەمۆیانەدا دێت کە ڕێسای ئیسلامییان وەکو سیستەمێك ڕاگیر کردووە. بۆ چارەسەرکردنی کێشەی بابەتەکانی تاك و کۆمەڵ، دەوڵەت و نەتەوە، پەروەردە و فێرکردن و زانست، ئابووری و

کۆمەڵایەتی، شورا دارای گرنگترین ئەرك و فەرمانە. بێگومان ئەگەر دەربارەی ئەم بابەتانە "دەق"ێکی خاوەن مانای ئاشکرا بوونی نەبێت..

لە ئیسلامدا "ڕاوێژی دەوڵەت" لە پێش دەسەڵاتی جێبەجێکردنەوەیە و دەزگایەکی وایە کە ڕابەڕایەتی دەکات. لەم ڕۆژگارەدا لە جێگای ئەمەدا "ئەنجوومەنی ڕاوێژکاری" هەیە کە بەراورد بە شورای ئیسلامی فەرمانەکەی سنووردارە و مەیدانی جووڵەی تەسکە و دەزگایەکی بچووککراوە و پەستێنراوە.

تەنانەت ئەگەر سەرۆکی دەوڵەت لەلایەن خواوە پشتیوانی لێ بکرێت و بە ئیلهامیش ڕێی نیشان بدرێت، دیسان ناچار کراوە بە ڕاوێژکردن.. هەتا ئەمڕۆش ئەمە هەر وا هاتووە. ئەگەر جاروباریش کەسانێك هەبووبن کە فەرامۆشیان کردبێت، وەلێ لە هەمان کاتدا ژمارەی ئەو کۆمەڵگا و نەتەوانەش کەم نین کە لەژێر ناو و نیشانی جۆراوجۆردا هەستاون بە جێبەجێکردنی. لەڕاستیدا هەتا ئەمڕۆ هیچ کۆمەڵگایەك نییە ئەم بابەتەی فەرامۆش کردبێت و سەرکەوتوو بووبێت. مەگەر پێغەمبەرمان (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) ڕزگاری و بەرەوپێشچوونی ئوممەتەکەی بە وتەی "ئەو کەسەی ڕاوێژ بکات نادۆڕێت"[١] نابەستێت بە شوراوە؟

شورا لە قورئانی پیرۆزدا لە دوو ئایەتدا بە ڕاستەوخۆ و لە چەندین جێگاشدا بەشێوەی ئاماژە و ناڕاستەوخۆ باسکراوە. یەکێك لەو دوو ئایەتەی کە زۆر ئاشکرایە و پێویستی بە هیچ جۆرە تەئویل و تەفسیرێك نییە، ئەم ئایەتەیە:

---

١. الطبراني، المجمع الأوسط ٣٦٥/٦.

﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي ٱلْأَمْرِ﴾ (آل عمران: ١٥٩)

"له کار و پێشهاتدا پرس و ڕایان پێ بکە."

ئەوی تریشیان ئایەتی:

﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ﴾ (الشورى: ٣٨)

"کاروباریان هەردەم بە مەشورەت و ڕاپرسی و ڕاوێژکارییە."

جگەلەوەش ناونانی سوورەتەکە بە "شورا"، لەو ڕووەوە کە باسی ئەم بابەتەی لەخۆ گرتووە، ئێجگار مانادارە!

لەم سوورەتەدا شورا وەك سیفەتێکی هاوەڵە بەڕێزەکان ناوزەد دەکرێت کە شایانی پیاهەڵدان و ستایشە. وەك بڵێی یادمان دەخاتەوە "ئەم مرۆڤانەی کە هەموو کاروبارێکیان بە ڕاوێژە چۆن دەکرێت ستایش نەکرێن!".. بەڵێ، لەگەڵ ئەوەدا کە هاوەڵە بەڕێزەکان بە دەیان خەسڵەتی تریان تێدایە کە شایانی ستایش بن، کەچی هەڵبژاردنی وشەی "شورا" بە تەنها لەم ئایەتە پیرۆزەدا و ستایشکردنی، بە سەرەگرێیەکی زۆر هەستیار دادەنرێت لەسەر گرنگی ڕاوێژکردن..

بەڵێ، هەروەك شورا لە قورئانی پیرۆزدا یاسایەکی وایە کە بە گرنگییەوە لەسەری دەوەستێت، بەهەمان ئەندازە سوننەتی پیرۆزیش گرنگی پێ دەدات و تەنانەت شایەتحاڵی جەختکردنەوە و پێداگری دەبین تیایدا. پێغەمبەرمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) سەبارەت بە هەموو بابەتێك کە دەقی لەبارەوە نەهاتبێت، ڕاوێژی بە ژن و پیاو و گەنج و پیر دەکرد، بەجۆرێك سەرەڕای هەموو ئەو پێشکەوتنانەی کە لە بوارە جیاوازەکاندا

تۆمارکراون، هێشتا ناتوانین بڵێین کە لە بابەتی ڕاوێژکردندا گەیشتووین بە ئاستی ئەو سەردەمەی ئەو.

بەڵێ، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لەسەر هەموو بابەتێك لەگەڵ هاوەڵەکانیدا ڕاوێژی دەکرد و بیر و ڕای ئەوانی وەردەگرت و نەخشەی بۆ هەر کارێك بکێشایە دەیکرد بە ماڵی ویژدانی گشتی و لەو ڕووەشەوە کە شورای وەك بەربەستێکی پارێزەر بەکاردەهێنا بۆ ئەو کارانەی کە بڕیاریان لەسەر دراوە، لە ڕووی بەهێزی و خۆگرتنەوە هێزێکی جیاوازی پێ دەبەخشی. واتە لەو کارانەدا کە نەخشەیان بۆ دەکێشرا، بەشداریی ڕۆحی و فیکریی هەموو کەسێکی مسۆگەر دەکرد و لەسەر پتەوترین بناغە پڕۆژەکانی دادەمەزراند.

با ئێستاش بەشێکی زۆر کورتی پەیوەندیدار بەم بابەتە، لە ژیانی پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بهێنین:

حەزرەتی پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامْ) کاتێك دەرچوو بۆ جەنگی ئوحود، چەند ئامۆژگارییەکی هاوەڵەکانی کرد و لەسەر چەند ستراتیژێك هەڵوێستەی کرد. نموونەی ئەو شتانەی کە هەستا بە جێبەجێکردنیان بە بێ بوونی نارەزایەتییەکی تەنانەت ناڕاستەوخۆش لەلایەن هاوەڵانیەوە، ئەمانەن: دانانی کۆمەڵێك تیرهاوێژ لەسەر گردێك، چۆنێتیی ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن، جێنەهێشتنی شوێنەکان لە هەر بارودۆخێکدا.. هەروەها هەندێك لە ئامۆژگارییەکان ئەوانە بوون کە هەموان گوێڕایەڵی بکەن و لاوازی نەنوێنن و شوێن دەستکەوتی جەنگ نەکەون.. هەرچەندە هاوەڵە بەڕێزەکانی سەر گردەکە لە هەستیاریی

ملکەچبوون بۆ فەرمان تێگەیشتبوون، بەڵام کەوتنە هەڵەی ئیجتیهادی ئەوەی کە گوایە ماوە و کاتی فەرمانەکە تەواو بووە. بەم جۆرە پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) ڕووبەڕووی یەکەم ناڕەزایەتیی ناڕاستەوخۆ و لە فەرمان دەرچوون بوویەوە لە ڕێگای ئوحوددا.

ئێستا ئەگەر کەسێکی تر لە شوێنی ئەو بووایە و یەك لەسەر یەك ڕووبەڕووی ئەم سەرپێچییانە ببووایەتەوە و پاش ئەو هەموو زەرەر و زیانەی کە پێیان گەیشت، پشتی لە ئەوان و بیر و ڕاکانیشیان دەکرد و دەیوت "بڕۆن حەواڵەی خوا بن!." بەڵام ئەو وای نەکرد، لەکاتێکدا لەو هێرشە بێبەزەییەدا کە هاوڕێکانی هۆکارەکەی بوون و دوژمنەکانیشی جێبەجێیان کرد، دەم و چاوی خەڵتانی خوێن بووبوو، لە حاڵێکدا کە چەندین شەهید جەستەیان پارچە پارچە کرابوو، کاتێك هەندێك لە هاوەڵەکانی کەوتبوونە خەمی گیانی خۆیان و تەنانەت هەندێکیان ڕێگای مەدینەیان گرتبوو. کاتێك دوای کۆتایی جەنگەکە کۆمەڵێکی تێکەڵ لە تاوانبار و بێتاوان دەوریان لێ دابوو، ئەو وەکو ئەوەی هیچ نەبووبێت ئایەتی ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي ٱلْأَمْرِ﴾ (آل عمران: ١٥٩) "لە کار و پێشهاتدا پرس و ڕایان پێ بکە"ی بەسەردا دەخوێندنەوە و دیسان بە مەبەستی ڕاوێژکردن لەگەڵیان دانیشتبوو. تەنها بەوەندەشەوە نەدەوەستا کە ڕاوێژیان پێ بکات، بەڵکو دەیفەرموو کە پێویستە لێیان خۆشببن و پێی ڕادەگەیاندن کە هەواڵی لێخۆشبوونی ئەوانی لە خواوە وەرگرتووە.

بەم شێوەیە پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) هەرچەندە ژیانی پیرۆزی لە ڕۆشنایی وەحیدا بەسەردەبرد، بەڵام بەم ڕەفتارانەی ئەوەی دەردەخست کە فەرمانی ڕاوێژی لەلایەن خواوە پێکراوە و کاربەدەستانی

ئاگاداردەکردەوە لە بەرپرسیارێتییەکانیان و هەلی ئەوەشی دەرەخساند بۆ کەسانی ئاسایی کە بیر و ڕای خۆیان بگەیەنن. هەروەها ڕێگایەکی وای والا دەکرد کە بەرێوەبراوان بتوانن یارمەتیی بەرێوەبەران بدەن و یادی فەرمانڕەوایانیشی دەخستەوە کە زۆرداری و ستەمکاری قەدەغەیە.

جگە لەوەش پاش جەنگی ئوحود و کاتێك فەرمانی پیرۆزی:

﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي ٱلْأَمْرِ﴾ (آل عمران: ١٥٩)

"لە کار و پێشهاتدا پرس و ڕایان پێ بکە."

هاتە خوارەوە، دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی "بێگومان نە خوا و نە پێغەمبەرەکەشی پێویستیان بە ڕاوێژ نییە. ئەوەندە هەیە خوای گەورە شورای کردووە بە هۆکاری ڕەحمەت. کێ ڕاوێژ بکات بێبەش نابێت لە گەیشتن بە حەقیقەت. کێش پشتگوێی بخات تووشی لادان دەبێت."[١] هەروەك لەم فەرموودەیەوە دەردەکەوێت، خوای گەورە بەوەی کە فەرمانی ڕاوێژی بە پێغەمبەرەکەی (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) کردووە لەکاتێکدا کە پێویستی نییە، دەخوازێت گرنگی شورا لە کاربەدەستان تێبگەیەنێت. پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) دەربارەی شورا فەرموویەتی:

"هەرکەسێك ڕاوێژ بکات پەشیمان نابێتەوە."[٢]

"هەرکەسێك ڕاوێژ بکات زیانی پێناگات."[٢]

"هەرکەسێك ڕاوێژ بکات لە پارێزراویدایە"[٣]

---

١. البيهقي، شعب الايمان ٧٦/٦.

٢. الطبراني، المجمع الأوسط ٣٦٥/٦.

٣. الترمذي، زهد ٣٩، الأدب ٥٧؛ أبو داود، الأدب ١١٤.

"کۆمەڵێك نەبووە ڕاوێژ بکات و نەگەیشتبێت بە ئەنجام."...

بە پشتبەستن بە هەموو ئەمانە، زانایانی ئیسلام تێکڕا کۆکن لەسەر ئەوەی کە شورا یەکێکە لە دەستووره بنەڕەتییەکانی ئیسلام و یەکێکیشە لەو حوکمانەی کە پێویستە لە ژیاندا پیادە بکرێت. ئەگەر لە هەندێك کات و سەردەمی جیاوازدا و لە بەرامبەر هەندێك حاڵەتی تایبەتدا، لە ڕووی جێبەجێکردنەوە هەندێك جیاوازیش هەبوبێت، کۆدەنگی لەسەر شورا هەر بەردەوام بووە.

* * *

هەڵبەتە شورا سەرچاوەیەکی یاسادانانی وا نییە کە لە پێش فەرمانە خواییەکانەوە بێت. ئەو، هەروەك پابەندی چەند یاسا و دەستوورێکە، بە هەمان جۆر سنووردار کراوە بە وابەستەبوون بە سەرچاوە ڕاستەقینەکانی یاسادانانەوە. بەڵێ، لە ئیسلامدا ئەو بابەتانەی کە "دەق"ی ئاشکرایان لەبارەوە هاتووە لە دەرەوەی چوارچێوەی دەستکاریی مرۆڤەکانن. لەم جۆرە بابەتانەدا تەنها بۆ مەبەستی دۆزینەوەی مانا و مەبەستی دەقەکە دەتوانرێت پەنا بۆ ڕاوێژ ببرێت. ئەو باسانەش کە دەقی ڕاستەوخۆیان لەسەر نەهاتووە بەتەواوەتی دەکەونە ناو سنووری شوراوە. لەم بابەتانەشدا ئەو دەرئەنجامەی بەدەستدێت و ئەو بڕیارەی دەدرێت، بەهەمان شێوەی دەقەکان، خەڵکان ناچاری شوێنکەوتن و جێبەجێکردن دەکات.. وە چیتر ناتوانرێت دژایەتیی ئەم بڕیارانە بکرێت.. ناتوانرێت بەرامبەریان گوزارشت لە بیر و ڕای دژ و پێچەوانەیان بکرێت. ئەگەر لە حاڵەتێکدا سەرەڕای شورا و کۆدەنگی، هەڵەیەك لە بڕیارەکەدا هەبێت، دەبێت دیسان لە هەمان ڕێگەی شوراوە ڕاست بکرێتەوە.

ئەو دەقانەی دەربارەی شورا هاتوون، هەرچەندە لە ڕوویەکەوە گشتگیرییان پێوە دیارە، بەڵام دیسانیش بەو دەقانەی قورئان و سوننەت کە تایبەتن بە چەند بابەتێکی دیاریکراو و بە هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانی پێغەمبەر سنووردار کراون. لەڕاستیدا دەقەکانی ئیسلام لە شێوەی چەند یاسایەکی گشتی و چەند دەستوورێکی کوللیدان و دەربارەی چەند بابەتێکی دیاریکراو هاتوون کە لەڕووی ژمارەوە کەمن. ئەگینا ئەو یاسانەی کە بە وردەکاری و لاوەکی دادەنرێن زۆر لەسەریان نەوەستاوە و نەچووەتە نێو وردەکارییانەوە. ئەو بابەتانەش کە دەقی ڕاستەوخۆیان لەسەر نەهاتووە، بەتەواوەتی دەچنە ناو بازنەی شوراوە و کراوە دەبن بەڕووی ڕاوێژدا.

بە پشت بەستن بەو حەقیقەتەی کە هەرچی بابەتێك دەقی ئاشکرای لەبارەوە هاتبوو لە دەرەوەی سنووری شورادایە و هەرچی بابەتێکیش دەقی ئاشکرای لەسەر نەبوو لە چوارچێوەی شورادایە، کەواتە دەتوانین بڵێین شورا زامنی وابەستەییە بە ئیسلام و قورئان و سوننەتەوە لە هەموو حاڵەت و بارودۆخێکدا و هەوڵ بۆ بەدیهێنانی ئەو مەبەستانە دەدات کە قورئانی پیرۆز دیاری کردوون. بێگومان لە گرنگترین ئەو ئامانج و مەبەستانەی کە ئیسلام نەخشەی بۆ کێشاون ئەمانەن: دامەزراندنی یەکسانی لەنێوان مرۆڤەکان.. شەڕکردن لە دژی نەزانی و بڵاوکردنەوەی زانست.. هەموو بابەتێك لە دەوری ناسنامەی موسڵمانێتی بچنرێت و ڕێگا بەوە نەدرێت موسڵمان لەگەڵ ئەسڵی خۆیدا دژ بوەستێتەوە.. ئاڕاستەکردنی ئەندامانی وڵات بۆ پاراستنی پێگە و شکۆیان لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی.. دامەزراندنی دادپەروەریی کۆمەڵایەتی لەنێوان

تاك و کۆمەڵدا.. پەرەپێدانی هەستەکانی وەك خۆشەویستی و رێز و هاوخەمی و فیداکاریی ماددی و مەعنەوی لەپێناو کەسانی تردا.. پاراستنی هاوسەنگیی نێوان دنیا و ئاخیرەت.. رێکخستنی سیاسەتی ناوخۆ و دەرەوە.. ئاگاداربوون لە گۆڕانکاری و پێشهاتە جیهانییەکان.. ئامادەکردن یان بەمۆدێرنکردنی سەرچاوەکانی هێز ئەگەر پێویستی کرد. هەموو ئەمانە کۆمەڵێك بابەتی پەیوەست بە مرۆڤایەتین کە لە دێر زەمانەوە فەرمانڕەوا گەورەکان و بیریارە مەزنەکان و فەیلەسووفە بلیمەتەکان بە پێداگرییەوە لەسەری وەستاون. پێغەمبەرە مەزنەکەی ئیسلامیش (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بەدرێژایی تەمەنی پیرۆزی بە دەرك کردن بە لێپرسراوێتیی خۆی، هەردەم ڕەچاوی ئەم ئامانجەی کردووە و ژیانی مرۆڤەکان و چالاکییە کلتوورییەکانیان و کار و پڕۆژەکانیان و پەیوەندییەکانی نێوانیانی لەسەر ئەم بناغانە دامەزراندووە و پەیوەندیی نێوان هەست و بیر و ژیری و لۆجیك و دڵی ئەوانی هەر بەم ڕێگایە بەرقەرار کردووە.

***

شورا کۆمەڵێك میوە و بەروبووم و چەند یاسایەکیشی هەیە کە دەمانگەیەنێت بەم میوەهاتانە. لە نموونەی ئەمانەش: بەرزکردنەوەی ئاستی بیر و چالاکیی کۆمەڵگا.. وەرگرتنی پرس و ڕای کۆمەڵ لە هەموو ڕووداوێکی نوێدا و یادخستنەوەی گرنگی خۆی بە خۆی.. هاندانی بۆ بەرهەمهێنانی بیرۆکەی بەدیل.. هێشتنەوەی شورا وەکو بنەمۆیەك و وەك مانشێتێك لەپێناو داهاتووی ئیسلامدا.. دەستەبەرکردنی بەشداریی زۆربەی زۆری خەڵك لە بەڕێوەبردندا بەبۆنەی هەر ڕووداوێکی

نوێوە.. زیندوو ڕاگرتنی هەستی چاودێریکردنی دەسەڵات لەلایەن خەڵکەوە و لێپێچینەوە لێی ئەگەر پێویستی کرد.. بەرگرتن لە ڕەفتاری نابەرپرسانەی بەڕێوەبەران و سنووردارکردنی دەسەڵاتیان...

وەکو پێشتریش ئاماژەمان پێکرد، هەر لەبەر ئەم گرنگییە زۆرەی شورایە کە قورئانی پیرۆز لە مەقامی مەدح و ستایشدا دەربارەی هاوەڵە بەڕێزەکان دەفەرموێت:

﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ﴾ (الشورى: ٣٨)

"کاروباریان هەردەم بە مەشورەت و ڕاپرسی و ڕاوێژکارییە."

جگەلەوەش لە کۆتایی جەنگی ئوحوددا و لەو کاتە پڕ لە ئێش و لەو کۆتاییە بەسوێیەدا، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دیسان فەرمانی مەشورەتی پێدەکرێت لەگەڵ ئەو هاوەڵانەیدا کە بوون بە هۆکاری ڕووداوەکە:

﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ﴾ (آل عمران: ١٥٩)

"لە کار و پێشهاتدا پرس و ڕایان پێ بکە."

ئەمەش لە خۆیدا دارای مانایەکی یەکجار ورد و گرنگە!

هەردوو ئایەتەکەی کە دەربارەی شورا هاتوون، تابلێی نەرمن و توانای کشانیان هەیە و ماهییەتیان بەجۆرێکە بتوانن پێویستی هەموو سەردەم و ڕۆژگارەکان جێبەجێ بکەن و سەرجەم کاتەکانیش تێبپەڕێنن. بەشێوەیەك دنیا چەند گۆڕانکاری بەسەردا بێت و کات و سەردەم چەند بگۆڕێن و تەنانەت ئەگەر مرۆڤەکان بتوانن لە بۆشایی ئاسمانیشدا

شارستانێتی پێکەوەبنێن، هێشتا پێویستیان بەوە نییە کە شتێك بۆ ئەم دەقانە زیاد بکەن. لەڕاستیدا هەموو دەستوور و یاساکانی تری ئیسلامیش دارای هەمان سیفەتی نەرمی و جیهانیبوونیان تێدایە.. وە سەرەڕای تێپەڕبوونی کات هەردەم ماقوڵێتی و لاوێتیی خۆیان پاراستووە و لە داهاتووشدا هەر دەیپارێزن..

*** 

پێمان باشە چەند تێبینییەك یاد بخەینەوە کە دەبن بە بناغەی شورا:

١. شورا، هەم بۆ بەڕێوەبەر و هەم بۆ بەڕێوەبراو مافە و سەبارەت بە بەکارهێنانی ئەم مافەش هیچ یەکێك لە لایەنەکان تایبەتمەندییەکی زیاتری لەوی دی پێنەبەخشراوە. کاتێك خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴾ (الشورى: ٣٨)

"کاروباریان هەردەم بە مەشورەت و ڕاپرسی و ڕاوێژکارییە."

ئاماژە بە پێگەی یەکسانی هەردوو لا دەکات. لەبەرئەوەی ئەو کاروبارانەی کە تایبەتن بە هەموو موسڵمانانەوە پەیوەندییان بە هەموو تاکێکی ئیماندارەوە هەیە، ئەوا لە باسکردن و تاوتوێ کردنی ئەو بابەتانەدا هەمان مافی یەکسان دراوە بە بەڕێوەبەر و بەڕێوەبراو. بەڵام هەروەك دەکرێت ئەم مافە بەگوێرەی کات و شوێن و هەلومەرجەکان شێوەی جیاواز لەخۆبگرێت، بەهەمان جۆر دەگونجێت شێواز و چۆنێتیی جێبەجێکردنەکەشی جیاواز بێت.

٢. بەگوێرەی فەرمانی:

﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ﴾ (آل عمران: ١٥٩)

"لە کار و پێشهاتدا پرس و ڕایان پێ بکە."

لە ڕاوێژکردن لەو بابەتانەدا کە پەیوەندی بە هەموو کۆمەڵگاوە هەیە، لەبەرئەوەی پێشکەشکردنی ئەو بابەتەی ڕاوێژی لەبارەوە دەکرێت بە ئەهلی پرس و ڕا بەرپرسیارێتیە، ئەوا هەروەك ئەگەر دەسەڵاتداران ئەم بەرپرسیارێتیە جێبەجێ نەکەن لێپرسراو دەبن، بەهەمان جۆر بەرێوەبراوانیش ئەگەر ڕا و بۆچوونی خۆیان لەسەر ئەو بابەتانە دەرنەبڕن کە ڕاوێژیان پێدەکرێت، لێپرسراو دەبن. تەنانەت نەك هەر بە دەرنەخستنی ڕا و پێشنیاریان، بەڵکو کاتێك سوورنابن لەسەر گەیاندنی ڕا و بۆچوونیان و پێداگریی ناکەن، ئەوا بە کەمتەرخەم ئەژمار دەکرێن لە ڕاپەڕاندنی ئەرکی هاوڵاتیبووندا.

٣. یەکێك لە بناغە گرنگەکانی تر ئەوەیە کە شورا لەبەر خاتری ڕەزامەندیی خوا و بەرژەوەندیی موسڵمانان ئەنجام بدرێت و ڕێگە نەدرێت بەهۆی بەرتیل و فشار و هەڕەشەوە دەستەی ڕاوێژکار لە ئاڕاستەی ڕاستەقینەی خۆیان بترازێنرێن. پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێت "ئەو کەسەی ڕاوێژی پێدەکرێت مرۆڤێکی ئەمینە، ئەو کەسەی لە بابەتێکدا پرس و ڕای پێدەکرێت، پێویستە بەجۆرێك بۆچوون دەرببڕێت وەك ئەوەی لەسەر خودی خۆی بڕیاربدات."[١]

٤. مەرج نییە هەموو کاتێك لە شورادا کۆدەنگی دروست ببێت. لەو

---

١. الطبراني، العجم الأوسط ٣٤٩/٢.

کاتەدا کە بۆچوونی هەمووان لەسەر خاڵێك کۆنابێتەوە، کار بە قەناعەت و ڕای زۆرینە دەکرێت. چونکە بەگوێرەی خاوەنی شەریعەت زۆرینە لە جێی ئیجماعدایە. ئەو بە فەرموودەکانی وەك:

"دەستی خوا لەگەڵ کۆمەڵدایە."[١]

"ئوممەتەکەم لەسەر خراپە و تاوان کۆنابنەوە."[٢]

"داوام لە خوا کرد ئوممەتەکەم لەسەر گومڕایی کۆنەبنەوە، ئەویش داواکەمی قبووڵ کرد."[٣] دەریدەخات کە زۆرینە هێزی ئیجماعی هەیە و بیرمان دەخاتەوە کە پێویستە شوێن زۆرینە بکەوین. دەکرێت زۆر نموونە لە ژیانی پیرۆزی پێغەمبەرەوە لەسەر ئەم خاڵە بهێنین. بۆ نموونە ڕاوێژی بەدر و، شورای سەرەتا و کۆتایی ئوحود لەم جۆرەیە.

٥. ئەگەر شورا بەشێوەی دروستی خۆی بەڕێوەچوو، داخۆ بە کۆدەنگی بێت یان بە ڕای زۆرینە، ئیدی جائیز نییە بەرهەڵستیی ئەو بۆچوونانە بکرێت کە لەوێدا لەسەری ڕێکەوتوون و چیدی بیرۆکەی بەدیل ناخرێتە ڕوو. وتنی "من ڕایەکی جیاواز و باشترم هەبوو." یان "من بۆچوونێکی پێچەوانەم هەبوو" و هاوچەشنەکانی، نانەوەی دووبەرەکی و گوناهێکی ئاشکرایە. پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيم) سەرەڕای ئیجتیهادی جیاوازی خۆی، پەیڕەوی لە ڕای زۆرینە کرد کاتێك دەرچوو بەرەو ئوحود، پاشان هیچ شتێکی نەوتووە بە ئیجتیهادی زۆرینە ئەگەر هەڵەش بووبێت و نەپێکابێت.

---

١. الترمذي، فيتن ٧.

٢. إبن ماجه، فيتن ٨.

٣. أحمد بن حنبل، المسند ٣٩٦/٦.

٦. شورا بە چارەسەرکردنی کێشە هەنووکەییەکانەوە سەرقاڵ دەبێت و زۆر لەسەر ڕووداوە گریمانکراوەکان ناوەستێت. خۆی لە خۆیدا ژیانی ئیسلامی لەژێر ڕۆشنایی دەقەکاندا بەڕێوەدەچێت. ئەو ڕووداوانەش کە دەکەونە دەرەوەی ئەو چوارچێوەیەوە، یان ئەو نەخشە و پرۆژانەی کە هەر دەبێت جێبەجێ بکرێن، بە ڕەچاوکردنی تایبەتمەندیی ئەو ڕووداو و پرۆژانە، پێویستە هەموو ڕووداوێك و هەموو نەخشەیەك بەگوێرەی چۆنێتییەکەی لەناو خۆیدا چارەسەر بکرێت.

٧. دەستەی تایبەت بە ڕاوێژ لە کاتی پێویستیدا کۆدەبێتەوە و کێشەکان چارەسەر دەکات و درێژە بە کارەکانی دەدات هەتا ئەو کاتەی نەخشە و پرۆژەکان دەگەیەنێت بەشێوەی کۆتایی. هەروەك هیچ دەقێك نییە لەسەر ماوەی نێوان شوراکان، بە هەمان جۆر هیچ نیشانەیەکیش نییە لەسەر ئەوەی کە ئەو کەسانەی پرۆسەی ڕاوێژ بەڕێوەدەبەن مووچە یان کرێیەکی تایبەتییان پێدەدرێت. شێوازە جۆراوجۆرەکانی جێبەجێکردنی شورا دوای سەردەمی تەشریع[1]، مەرج و سنوورێك نییە بۆ ئێمە. خۆی لە خۆیدا بەڕێوەبردنی شورا لە ڕێگەی کۆمەڵێك فەرمانبەری مووچەخۆرەوە هەندێك کێشە لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت...



مادەم باسەکەمان باسی شورایە، کەواتە پێویستە باسی ئەوەش بکەین کە دەبێت ڕاوێژ بە چ کەسانێك بکرێت. هەروەك ناگونجێت هەموو خەڵکی وڵات لە جێگایەکدا کۆبکەینەوە و ڕاوێژیان پێبکەین، کەواتە پێویستە بەناچاری لە ڕێگەی دەستەیەکی سنووردارەوە ئەنجامی بدەین.

---

١. مەبەست لێی سەردەمی پێغەمبەر (صَلَّىٰاللَّهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ) و خەلیفە ڕاشیدەکانە (رضيَاللَّهُعَنهم).

جگەلەوەش لەبەرئەوەی ئەو بابەتانەی بە نیازی ڕاوێژ دەخرێنە بەر باس پێویستیان بە زانست و ئەزموون و پسپۆڕی و لێهاتوویی و شایستەیی هەیە، ئەوا دەبێت دەستەی شورا لە کەسانێك پێکبێن کە ئەم تایبەتمەندییانەیان هەیە، ئەمەش تەنها بە دەستەیەکی هەرەمەزن دێتەدی کە دەتوانن ڕێگەچارە بۆ هەموو کێشەکان بدۆزنەوە و زانایان بە "ئەهلی حەل و عەقد" ناوزەدیان کردوون. بەتایبەتی لە ڕۆژگارێکی وەك ئەمڕۆماندا کە ژیان تەواو ئاڵۆز بووە و جیهانگیری باڵی بەسەر دنیادا کێشاوە و هەموو کێشەیەك بووە بە کێشەیەکی جیهانی، پێویستە هاوڕێ لەگەڵ مانای ئیسلامی و ڕۆحی ئیسلامی و زانستە ئیسلامییەکاندا، کەسانێك لەم دەستە هەرە مەزنەدا بوونیان هەبێت کە شارەزابن لە زانستەکانی تر -ئەوانەی کە زۆر جار سوود و بەرژەوەندییان بۆ موسڵمانان هەیە- و هونەر و تەکنەلۆجیای سەردەمدا. لەو بابەتانەدا کە پەیوەندییان بەم جۆری دووهەمەوە هەیە، بە مەرجی گونجان و تەبایی لەگەڵ دیندا، دەکرێت هەموو کاتێك ڕاوێژ بە کەسە پسپۆڕەکانی بوارە جۆراوجۆرەکان بکرێت. لەڕاستیدا هەروەك شورا بەجێهێڵراوە بۆ "ئەهلی حەل و عەقد"، بە هەمان شێوە جێبەجێکردنی لە کاتی جیاواز و شێوازی جیاوازدا، دیسان حەواڵەی ئەوان کراوە. کاتێك تەماشای مێژوو دەکەین، دەتوانین چەندین جێبەجێکردنی جۆراوجۆری شورا ببینین لە حاڵەت و بارودۆخ و سەردەمە جیاوازەکاندا. بەڵێ، بەدرێژایی مێژوو شورا گاهـ لە بازنەیەکی بچووك و گاهـ لە بازنەیەکی فراواندا، گاهـ تەنها لەناو خەڵکی سیڤیلدا و گاهـ بانگهێشتنی کەسانی پسپۆڕی زانستی و سەربازی کردووە و کاری خۆی ڕاپەڕاندووە. بەڵام ئەمە لەوەوە سەرچاوەی نەگرتووە

کە یاسایەکی وابێت شایانی گۆڕان بێت، بەڵکو زیاتر هی ئەوەیە کە دەکرێت لە هەموو ڕۆژگارێکدا جێبەجێ بکرێت و توانای کشانی هەیە و گشتگیر و جیهانییە.

ئەگەرچی بەگوێرەی سەردەم و بارودۆخە جیاوازەکان شێوازی ڕاوێژکردن بگۆڕێت و ئەندامانی دەستەی ڕاوێژکاری گۆڕانکاری و فرەڕەنگی بەخۆیانەوە ببینن، بەڵام هەرگیز سیفەتەکانی وەك زانست و دادپەروەری و ئەزموون و حیکمەت و فیراسەت نابێت لە ئەندامانی دەستەی هەرەمەزنی شورا داببڕێن. دادپەروەری مانای بەجێهێنانی فەرزەکان و خۆپاراستن لە حەرامەکان و نەکردنی کارگەلێکە کە پێچەوانەی بەها مرۆییەکان بێت. زانست واتە پسپۆڕیی دینی و ئیداری و سیاسی و هونەری. مەرج نییە ئەندامانی دەستەکە لە بوارە جۆراوجۆرەکانی زانستەکاندا پسپۆڕ بن، ئەوەندە بەسە کە کراوەبن بەڕووی ئەو بابەتانەدا کە لە سەرەوە ناویان هێنرا. هەندێك جار لەو بابەتانەدا کە ئەزموون تیایدا بناغەیە، دەکرێت بیر و ڕای کەسانی خاوەن ئەزموون و شارەزایی وەربگیرێت، هەرچەندە لە دەرەوەی ئەو پسپۆڕییەشدا بن. حیکمەت، هەروەك بە مانای زانست و حیلم و نبووەتیش دێت، بریتییە لە شارەزایی بە ئەودیو پەردەی شتان و، هەستکردن و بینینی ئەو شتانەی کە داخراون بەڕووی خەڵکدا بە نووری فیراسەت و، توانای چارەسەرکردنی کێشە کەسی و کۆمەڵایەتییەکان و، مانای لێهاتوویی و فەتانەتیش خراوەتە سەر شانی. ئەمە هەمیشە وەك تایبەتمەندییەکی پلەباڵا قبووڵ کراوە کە ئەربابی کەمە.

***

ئەو گرنگییە زۆرەی کە پێغەمبەری ئازیزمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لە ژیانی پیرۆزیدا بە شورای داوە و ئەو ڕێژەی کە گرتوویەتی لە ڕا و بۆچوونی گەورە و بچووك و لاو و پیر، خۆی لە خۆیدا بابەتێکە پێویستە سەربەخۆ باس بکرێت.

بەڵێ، ئەو هەموو کاتێك پرسی بە کەسانی تر دەکرد.. بۆچوونی هەمووانی وەردەگرت و لە ڕێگەی شوراوە هەوڵی بۆ دۆزینەوەی ئەو ڕێگایانە دەدا کە بەهۆیانەوە نەخشە و پرۆژە بەدیلەکان لەسەر زەمینەیەکی توندوتۆڵ دابمەزرێنێت. جاری وابوو یەك بە یەك بۆچوونی خۆی بۆ ئەهلی پرس و ڕا هەڵدەڕشت، جاری واشبوو "ئەهلی حەل و عەقد"ی کۆدەکردەوە و گرنگی زۆری دەدا بە دەستەبەرکردنی پاڵپشتیی شعووری دەستەجەمعی بۆ بڕیارەکان.

ئێستا ئەگەر پێتان خۆشبێت و بە مەبەستی زیاتر ڕوونکردنەوە، چەند نموونەیەك لەم بارەیەوە دەهێنینەوە:

١. پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لە ڕووداوی بوختانکردنی دووڕووەکان بۆ حەزرەتی عائیشەی دایکمان، پرس و ڕای بە حەزرەتی عەلی و حەزرەتی عومەر و زەینەبی کچی جەحش و بەریرە و چەندین هاوەڵی بەڕێزی تر کرد. چەندین کەسی پیرۆزی وەك حەزرەتی عومەر و زەینەب و بەریرە شایەتییان بۆ پاکێتی و بێگەردیی حەزرەتی عائیشە دا. تەنانەت دەگێڕنەوە کە گفتوگۆیەکی نیانی -هەرچەندە لە ڕووی سەنەدەوە ڕەخنەی لێ دەگیرێت- لەم شێوەیە لەنێوان پێغەمبەر و حەزرەتی عومەردا ڕوویداوە:

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بۆچوونی حەزرەتی عومەر

دەپرسێت دەربارەی حەزرەتی عائیشە. ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت "ئەی پێغەمبەری خوا! بەدڵنیاییەوە ئەو پاك و بێگەردە!" کاتێك پێغەمبەر (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ) لێی دەپرسێت کە لەسەر چ بنەمایەك ئەو بڕیارەی دا، دەفەرموێت "ڕۆژێکیان نوێژت بۆ دەکردین. پێش ئەوەی دایبەستیت نەعلەکانت داکەند. کاتێك دوای نوێژ لەبارەی ئەو کارەوە پرسیارت لێکرا، فەرمووت کە پیسییەك چووە لە نەعلەکەتەوە و جیبریل هەواڵی پێ داویت. ئێستا ئەگەر شتێکی لەو جۆرە لە خێزانە پاکیزەکەتەوە بچووبایە، خوای گەورە ئاگاداری نەدەکردیتەوە..؟!"[1] ئەگەر ئەسڵی ئەم ڕووداوە بەگوێرەی پێوەرەکانی فەرمووده کێشەی لەسەر بێت، بەڵام خۆ هیچ شتێك دەربارەی فەسڵەکەی ناتوانرێت بوترێت.

٢. کاتی دەرچوون بۆ جەنگی بەدر پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ) ڕاوێژی بە کۆچبەر و پشتیوانانیش کرد. میقداد[2] بە ناوی کۆچبەران و سەعدی کوڕی موعازیش[3] بە ناوی پشتیوانانەوە قسەیان کرد و، پاڵپشتییان لە بۆچوونەکەی پێغەمبەر (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ) کرد و، وتەکانیان ئیمان و ملکەچی و هەیەجانی لێ دەچۆڕا و، بوون بە مایەی ڕازی بوونی کۆمەڵەکانیان بەو بڕیارەی دەرکرا و پاڵپشتیی ئەوانیان بۆ ئەنجامی ڕاوێژەکە مسۆگەر کرد. وەکو دەبینرێت لێرەشدا پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ) کۆمەڵگا دەکات بە خاوەنی بڕیارە گرنگەکان و پاڵشتیی ویژدانی گشتی بەدەست دەهێنێت، ئنجا هەڵدەستێت بە جێبەجێکردنی کارێك.

---

١. الحلبي، السيرة الحلبية ٢/٦٢٤-٦٢٥.

٢. إبن سعد، الطبقات الكبرى ٢/١٤.

٣. إبن أبي شيبه، المصانيف ٧/٣٥٣.

٣. دیسان له بەدردا دەربارەی ئەوەی سوپای ئیسلام له کوێ خێوەت هەڵبدات و له چ شوێنێکدا ڕووبەڕووی دوژمن ببێتەوە، ڕاوێژ به هاوەڵانی وەك حوبابی کوڕی مونزیر دەکات و لەژێر ڕۆشنایی بیر و بۆچوونی ئەواندا بڕیاری دا. هەربۆیە ئەو سوپای ئیسلامەی که لەم چوارچێوەیەدا هەڵسوکەوتی کرد، توانی به یەك هێرش دوژمنەکەی که سێ بۆ چوار قات لەو زۆرتر بوو بشکێنێت و هاوڕێ لەگەڵ سروودی سەرکەوتندا بەرەو مەدینه بگەڕێتەوە.[١]

٤. ئەوەی که له ڕووداوی ئەحزابدا و له دەمی ڕاوێژکردن به هاوەڵەکانیدا مەیلی دا به بۆچوونی سەلمانی فارسی و فەرمانی دا به هەڵکەندنی خەندەق لەو جێگایانەدا که دەگونجا دوژمن لێوەی دزه بکەنە شاری مەدینەوە، یەکێکی تره لەو تابلۆیانەی که دەریدەخات ئەو پێغەمبەره (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) چەند گرنگی به شورا داوه.[٢]

٥. له دەمی ڕێکەوتننامەی ئاشتیی حودەیبییەدا پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) ئەوپەڕی گرنگی به شورا داوه و پاش وەرگرتنی بیر و ڕای هەمووان، ڕاوێژکردنی به ئوم سەلەمەی دایکمان لەیاد نەکرد و، پاشان به ئاڕاستەی ئەو بیر و بۆچوونانەی خرانه ڕوو، ڕێگا و ستراتیژێکی وای هەڵبژارد که دۆڕانێکی حەتمی گۆڕی به سەرکەوتن و بەو شێوەیه بۆ مەدینه گەڕانەوە.[٣]

ئەگەر له نزیکەوه تەماشای ژیانی پیرۆزی ئەو بکرێت، دەبینرێت

١. إبن هشام، السيرة النبوية ٣/١٦٧-١٦٨.
٢. إبن هشام، السيرة النبوية ٤/١٧٢-١٨٢.
٣. البخاري، شروط ١٥؛ أحمد بن حنبل، المسند ٤/٣٣٠.

کە هەموو ئەو کێشە و بابەتانەی دەکەونە دەرەوەی چوارچێوەی وەحیەوە، ئەو بە شورادا تێیپەڕاندوون و پاش پێشکەشکردنی لەبەر چاوی ویژدانی گشتیدا، ئنجا خراوەتە بواری جێبەجێکردنەوە. هەربۆیە هەموو ئەو کۆڕی شورایانەی کە دوای ئەو لە دەوڵەتە ئیسلامییەکاندا دەبینرێن، هیچ نین جگە لە وێنەیەکی سادەی ئەو یەکەم شورا و دەستەی ڕاوێژکارییە.

## بزاوتن و بیر

دەگونجێت هێڵی خەباتمان وەکو میراتگرانی زەوی لە هەردوو وشەی "بزاوتن" و "بیر"دا کورت بکەینەوە. خۆی لەخۆیدا ڕێگای هەبوونی ڕاستەقینەش بە بزاوتن و بیردا تێپەڕدەبێت. بە بزاوتن و بیرێکدا کە خاوەنی ماهییەتێکی وایە دەتوانێت خۆیشی و کەسانی تریش بگۆڕێت. لەڕاستیدا لە ڕوویەکەوە هەموو بوونەوەرێك وەك بەرهەمی چەند یاسایەك و بزاوتن وایە. مانەوەکەشی دیسان پەیوەستە بە بزاوتن و ئەو یاسایانەوە.

گرنگترین و پێویستترین ڕووداوی ژیانمان بزاوتنە. ئێمە ناچارین ئەگەر لەو پێناوەدا زۆر شتی تریش لەدەست بدەین، هەمیشە بە بزاوتن و هەردەم بە هزر، بچینە ژێر باری چەند لێپرسراوێتییەکەوە و سنگ لە هەندێك کێشە دەربپەڕێنین و خۆمان بە مەحکوومی بزاوتن و جووڵە بزانین.. بەڵێ، ئەگەر وەك خۆمان ڕەفتار نەکەین، دەچینە ژێر کاریگەریی شەپۆلی جووڵە و گەرداوی نەخشە و بیری کەسانی ترەوە و ناچار دەبین نوێنەرایەتیی بزاوتنی کەسانی دی بکەین.

هەمیشە وەستان و دوورەپەرێزی لەو شتانەی لە چواردەورمان ڕوودەدەن و دەست نەدان لەو پێکهاتانەی لە نزیکمان پێکدێن، وەك ئەوە وایە

بەدەستی خۆمان، خۆمان بتوێنینەوە، وەك حاڵی پارچە سەهۆڵێك کاتێك دەکەوێتە ناو ئاو. توانەوەیەکی لەم شێوەیە کە ناتوانین پارێزگاری لە گەردەکانی ناخمان بکەین، مانای خۆبەدەستەوەدانە بۆ ئەو پێکهاتنانەی کە دژی خۆمان و پێچەوانەی ئەسڵمانن. ئەوانەی دەیانەوێت وەك خۆیان بمێننەوە، پێویستە بە هەموو ئارەزوو و ویست و دڵ و ویژدان و جووڵە و بیریان داوای بکەن. چونکە بۆ مانەوە دەبێت سەرتاپای ناوەڕۆکی مرۆڤ لە ئامادەباشیدا بێت. بەڵێ، سەرەتا هەبوون، پاشان مانەوەی بوون، داوای قۆڵ و باڵ و دڵ و سەر لە مرۆڤ دەکات. ئەگەر ئێمە لەپێناو بوونی سبەینێماندا هەر لە ئێستاوە دڵ و سەرمان فیدا نەکەین، کەسانی دی، لە کات و لە شوێنێکی وادا کە هیچ سوودێکی بۆ ئێمە نییە، لەوانەیە چاو لە چاومان ببڕن و داوای ئەمانەمان لێ بکەن.

دیارترین لایەنی بزاوتن و بیری ئیسلامی بریتییە لە: بوون بە خۆمان، کردنی ویستەکانمان بە ویست و ئارەزووی هەموو جیهان، پاشان دۆزینەوەی ڕێگایەکی جووڵان بۆ خۆمان لە نێوەندی تەواوی بووندا و مانەوە لە خولگەی سووڕانەوەی خۆماندا لە ناوەندی جووڵەی گشتیی گەردووندا. واتە لە لایەك ئاوێزانبوون لەگەڵ هەموو بوون، لە لایەکی تریشەوە پاراستنی هێڵی بنچینەیی خۆمان. ئەو کەسەی پەیوەندی لەنێوان جیهانی تایبەتی خۆی و بوونی گشتیدا دروست نەکردووە و هەست بە پەیوەندییەکانی لەگەڵ گەردووندا ناکات و بە ئارەزووە کەسی و هەندەکییەکانی خۆیەوە بەستراوەتەوە و داخراوە بەڕووی ڕاستییە جیهانییەکاندا، خۆی لە هەموو بوون دادەبڕێنێت و خۆی دەخاتە باوەشی کوشندەی زیندانی خۆپەرستییەوە. هەموو ئارەزووە جەستەییەکان

و سەرجەم ئەو شەڕانەش کە لەسەر جیسمانییەت دەکرێن و هەموو ئەو دڵنەواییە ساختە و بۆشانەی کە لەواندا بەدوایاندا دەگەڕێین، بێ هیچ گومانێك کاتێك ڕوودەدەن کە مرۆڤ لە بوون دادەبڕێت و بە تەنها خۆی دەمێنێتەوە. مەردی ڕاستەقینەی بزاوتن و بیر، دنیاکەی و بەختەوەریی ناو دنیاکەشی، ڕەنگی جیهانی گرتووە و بۆنی ئەبەدییەتی لێ دێت. لەم ڕووەوە ئەو وەك ئەوە وایە سەرەتا و کۆتایی نەبێت. گەر هەشیبێت، وێناکردنەکانی ئێمە تێدەپەڕێنێت. لەم ڕووەوە کاتێك دەوترێت "مرۆڤی بەختەوەر"، ئێمە هەمیشە بیری ئەم جۆرە کەسانەمان دەکەوێتەوە. خۆی لە خۆیدا ناوزەدکردنی بەختەوەرییەك کە سەرەتا و کۆتایی هەیە بە بەختەوەری، مەحاڵە.

بە دەربڕێنێکی ناوازەتر، دەتوانین بڵێین کە بزاوتن بریتییە لەوەی مرۆڤ هەموو بوون هاوڕێ لەگەڵ قووڵترین و دڵسۆزترین هەستدا لەباوەش بگرێت و بیخاتە ژێر ڕۆشنایی شیکردنەوەوە و لە ڕاڕەوەکانی ناو ئەوەوە بەرەو جاویدانی هەنگاو بنێت و پاشان بەو نهێنی و هێزەی کە لە "بەدیهێنەری ڕەها"وە وەریدەگرێت و بە بەکارهێنانی سەرتاپای زیرەکی و ئیرادەی، جیهانەکەی خۆی بە ئاڕاستەی ئامانجی بەدیهاتن بخاتە گەڕ.

هەرچی بیریشە، ئەوا بزاوتنێکی ناوەکییە. بیری ڕێکخراو و ئامانجدار بریتییە لە پرسینی هەموو ئەو نهێنی و گرێکوێرانەی کە بەدرێژایی ژیان ڕووبەڕوومان دەبنەوە لە هەمان ئەو گەردوونەی کە تێیداین و وەرگرتنی وەڵامەکان لێی. بە واتایەکی تر، "بیر" -بەهۆی دامەزراندنی خزمایەتییەك لەگەڵ سەرجەمی بووندا- بریتییە لە چالاك بوونی ئەو

شعوورەی کە لە هەموو جێگایەکدا و لەسەر زەمانی هەموو شتێك بەدوای حەقیقەتدا دەگەڕێت.

لە سایەی بیردا ڕۆحی مرۆڤ ئاوێزان دەبێت لەگەڵ جیهاندا و هەمیشە لەناو خۆیدا فراوان دەبێت.. قاڵبە تەسکەکانی "عەقڵی مەعاشی" دەدڕێنێت و دەڕژێتە دەرەوە و لەو وەهمانە ڕزگاری دەبێت کە لە قووڵاییەکانی ڕۆح خزاون و چاوی بە ڕاستییەکاندا دەکرێتەوە. بە واتایەکی تر بیر، بە مەبەستی ئامادەکردنی زەمینە بۆ ئەزموونی مێتافیزیکی لە قووڵایی ناخی مرۆڤدا، بریتییە لە دووبارە خاڵیبوونەوە لە خۆدا. ئەگەر ئەمە یەکەم پلەی بیر بێت، کۆتا پلەی ئەو پلیکانەیە بیری بزۆکە.

دینەمۆی بنەڕەتیی ژیانی بزاوتن و بیری ئێمە ژیانی ڕۆحیمانە. مەحاڵە ژیانی ڕۆحیشمان لە بیروباوەڕی دینیمان جیابکرێتەوە. ئەم ئوممەتە هەر جەنگێکی لەپێناوی هەبوون و مانەوەدا کردبێت و سەرکەوتبێت، لە سایەی هانا بردنیەوە بووە بۆ ڕۆح و مانای ئیسلامی. وەك سەوزبوونی تۆوێك کاتێك دەکەوێتە ناو سینەی خاك، چەشنی کرانەوەی چرۆ کاتێك ڕوو لە ڕووناکی دەکات، ئوممەتەکەشمان تەنها ئەو کاتە قووڵاییەکانی ناخی دەرکەوتووە کە ڕووی لە ئیسلام کردووە. ئەم ڕووتێکردن و گەیشتن بە بنەچەیە، هەروەك توانا و لێهاتنەکانی ناو ماهییەتی ئەویان دەرخستووە، بووە بە دەستەبەری بوون و مانەوەشی. بەڵێ، هەروەك دامەزراندنی ژیانی دڵ و ڕۆح لە جیهانی ناوەوەی ئەودا لە سایەی عیبادەت و زیکر و فیکردا دەبێت، بەهەمان جۆر باوەش کردنی هەموو بوون و هەستکردن پێی لە ترپەکانی خۆیدا و دەرك کردنی بە هەموو تواناکانی مێشکی، دیسان پەیوەستە بە شعووری عیبادەت و

زیکر و هەوڵی فیکرەوە. خۆی لە خۆیدا ئیمانداری ڕاستەقینە هەموو ڕەفتارێکی عیبادەت و هەموو بیرکردنەوەیەکی موڕاقەبە و هەموو وتەیەکی موناجات و داستانی مەعریفەتە و هەموو نیگایەکی بۆ بوون وردبوونەوە و تێڕامانە و پەیوەندیشی لەگەڵ هاونیشتیمانییەکانیدا شەفەقەتێکی ڕەحمانییە. گەیشتن بە ڕۆحانییەتێك لەم ئاستەدا پەیوەستە بە کراوەبوون بەڕووی هەر لە هەستەکانەوە تا لۆجیك و داوەریی عەقڵی، لە لۆجیك و داوەریشەوە تا ئیلهام و واریداتی خوایی. بە واتایەکی تر، تا ئەزموون بە باڵاوگەی ژێریدا تێنەپەڕێت و عەقڵ ملکەچی فەتانەتی هەرەمەزن نەبێت و لۆجیك نەگۆڕێت بە عەینی خۆشەویستی و خۆشەویستیش نەگۆڕێت بە عەشقی ئیلاهی، گەیشتن بەم لوتکەیە مەحاڵە. بەڵام کە هاتەدی و لە سایەی ئەم گۆشەی ڕوانینەوە، زانست دەبێت بە ڕەهەندێکی ئایین و دەبێت بە خزمەتکاری.. عەقڵ لە دەستی ئیلهامدا دەگۆڕێت بە تەوژمێك لە نوور کە دەگات بە هەموو جێگایەك.. ئەزموونەکانیش ماهییەتی ئاوێزەیەك وەردەگرن کە ڕۆحی بوون دەداتەوە.. وە هەموو شتێك سروودی مەعریفەت و خۆشەویستی و زەوقی ڕۆحانی دەچڕێت.

ئەمڕۆ ئەگەر هەندێك لە چین و توێژەکانی مرۆڤی ئێمە، سەرەڕای ئەوەی هەڵگری هەمان هەست و بیرن و هەمان حاڵەتی ڕۆحی بەش دەکەن لەگەڵ کەسانی تردا، کەچی سەرەڕای ئەم هەموو خاڵە هاوبەشە هێشتا بەو شێوە ئەرێنییە هەڵسوکەوت نەکەن کە لێیان چاوەڕێ دەکرێت و تەنانەت جاروبار بچنە ناو لادان و خراپکارییەکانەوە، پێویستە لەو ڕاستییەدا بەدوای هۆکاری ئەمەدا بگەڕێین کە ئەم مرۆڤانە ئیمانداری

ڕاستەقینە نین. ئیمانداری ڕاستەقینە لە هەر قاڵبێکدا بێت و چەند گیروگرفت و ناڕەحەتیش بهێنرێنە ڕێگەی، پێویستە هەمیشە ڕەنگی ئیمانی لێ نیشتبێت و هەڵسوکەوتەکانیشی لە خولگەی فیکردا بن.

لەم ڕووەوە ئەو میراتگرانەی زەوی کە نەخشەی دامەزراندنی دنیای ئایندەیان کێشاوە، دەبێت بزانن دەیانەوێت چ جۆرە دنیایەك بنیات بنێن و لە ئاوەدانکردنەوەی ئەم دنیایەشدا چ گەوهەرگەلێك بەکاردەهێنن، تا دواتر ناچار نەبن ئەو شتانە بڕووخێنن کە پێشتر بەدەستی خۆیان بنیاتیان ناون. ڕەگەکانی مەعنا و بناغە بنەڕەتییەکانی هەزار و ئەوەندە ساڵەی ژیانی ئێمە ڕوون و ئاشکران. پێویستە ئەندازیارانی ڕووناکی لە ئایندەدا، هاوڕێ لەگەڵ پاڵنەرەکانی بزاوتن، هێزی بیرکردنەوەشیان بەگەڕبخەن، تاکو ژیانی دینی و میللیمان جارێکی دی دەنگی ئیسلام وەربگرێت و گوێ لە دڵی ئەو ڕابگرێت، ئەمەش بە سوودوەرگرتنی تەواوەتی لە فراوانی و توانای چەمینەوە و جیهانیبوونی پاڵنەرە مێژووییەکان. بەمەرجێك قورئان و سوننەت و ئیجتیهادی پاك و بێگەردی پێشینان پارێزراو بێت و ئاست و شێواز و ئامرازەکانی ڕۆژگار ڕەچاوبکرێن، تا لەم ڕێگای "ژیانەوەی دوای مردن"ەدا ناچار بە ژیانێکی بەرزەخ ئاسا نەبین. ئەمەش پێش لە هەر شتێکی تر، پەیوەستە بە دوورکەوتنەوە لە هەموو پاڵنەر و فشارەکانی نەفسانییەت و کرانەوە بەڕووی ڕۆحانییەتدا و تەماشاکردنی دنیا وەك ئەوەی هۆڵی چاوەڕوانیی ئەودیو بێت. بە دەربڕینێکی تر، گۆڕینی چەندێتیی پەرستشەکانمان بە چۆنێتی.. پڕکردنەوەی ئەو کەموکورتییەی کە لە کەمی و چەندێتیی ئەوراد و ئەزکارەکانمانەوە سەرچاوە دەگرێت بە نییەت و ئیخلاس.. وە بەوە دێتەدی

که مەعریفەت و ڕێزێکی وا لە دوعا و موناجاتەکانماندا هەبێت بزانین لە خوایەك دەپاڕێینەوە کە لە خۆمان لێمان نزیکترە، ئەمەش تەنها ئەوانە هەستی پێ دەکەن کە نوێژ وەك پلیکانەی میعراج دەبینن و، ڕۆژوو وەك خەڵوەتێك تەماشا دەکەن لە نهێنی و شاراوەییەکی ئیلاهیدا و، وەك دابەشکار و کەسێك کە ئەمانەتێکی لا دانراوە و بەدەم وتنی "ئۆخەی!"ەوە زەکات لە ماڵیان دەردەکەن و، حەج وەك کۆنفرانسێکی جیهانیی دەبینن بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی جیهانی ئیسلامی، کۆنفرانسێك کە تیایدا ڕۆح و دڵ دەتوانن سەرنج لە نوورانییەت و شکۆمەندیی جیهانەکانی ئەودیو بدەن.

هەستکردن بە هەموو ئەمانە و پاشان پەیڕەوکردنیان لە ژیاندا، وابەستەی ئەو پزیشکە مەعنەوی -کە دەتوانن کێشە ناوخۆیی و دەرەکییەکانمان دەست نیشان و چارەسەر بکەن- و ئەو ڕابەرە ڕاستگۆیانەیە کە هەمیشە لەگەڵ ئەودیودا لە پەیوەندیدان. ئەو ڕابەرانەی کە دنیای بیرکردنەوەیان هەر لە ماددەوە بۆ مەعنا و لە فیزیکەوە بۆ مێتافیزیك و لە فەلسەفەوە بۆ تەسەووف درێژدەبێتەوە. هەروەك لە دوێنێوە تا ئەمڕۆ ئەمانە لە پشتی سەردەمەکانی ئاوەدانکردنەوەوە بوون، لەمڕۆ بەدواشەوە هەر ئەمان ڕابەرایەتیی بزووتنەوەکانی ژیانەوە و زیندووبوونەوە دەکەن. ئەم نوێنەرایەتییەش بە هێنانەکایەی کۆمەڵە پرۆژەیەکی نوێ دەبێت - کە لە قورئان و سوننەتەوە سەرچاوەیان گرتووە- لەمەڕ ڕووداوە نوێیەکان و ئەو پێشهاتانەی کە لە ئاییندەدا دێنەڕێ.. بە ڕازاندنەوەی هزریان بە بۆچوونە نوێیەکانی جیهان.. یەکلاکردنەوە و دەمەزەردکردنەوەی ڕۆح و شعووری نەتەوەیی لەژێر ڕۆشنایی ڕوانگەی ئیسلامیدا.. هاوڕێ

لەگەڵ وابەستەبوون بە هەستی تەجرید، بە داهێنانی تێگەیشتنی تازەی هونەری کە لەگەڵ جیهانیبوونی ئیسلامدا تەبا بێت.. بە هەڵشێلانی کلتووری خۆمانە کە دین و دنیای لەخۆگرتووە و چەند هەزار ساڵە بەردەوامە. نوێنەرایەتییەکی لەم جۆرە لە ساڵانی داهاتوودا، ژیانی زانستی و هونەری و دینیی ئێمە، پێش میللەتانی تری دنیا دەخات و دامەزراوی و ڕاستڕەوی بە هەموو بوارەکانی ژیان دەبەخشێت و منداڵە خوێندەوار و نەخوێندەوارەکانمان کە وەك ئاوارەیەك لە کۆڵانەکانماندا دێن و دەچن، دەکات بە خاوەنی فیکر و هونەر و مەعریفەت و پیشەسازیی سبەینێ. لە سایەی ئەمەدا هەموو کوچە و کۆڵانەکان چەشنی داڵانی قوتابخانەکان بۆنی عیرفان لە خۆیان دەدەن.. زیندانەکان دەگۆڕێن بە خانەی زانست.. خێزان و لانەکانیش وەك باخی بەهەشت دەڕازێنەوە.. لە هەموو جێگایەکدا دین و زانست هاوشانی یەك دەڕۆن.. ئیمان و ژیری دەست لەناو دەستی یەك میوە بەسەر هەموو لایەکدا دەبارێنن.. داهاتوو، لە باوەشی ئومێد و هیوا و خەباتدا لە یوتۆپیاکان زیاتر دەگەشێتەوە و گوڵ دەکات.. تەلەفزیۆن و ڕادیۆ و ڕۆژنامە و گۆڤارەکان بەرەکەت و ڕووناکی و جوانی بە چواردەوردا دابەش دەکەن.. وە جگە لەو پاشماوانەی کە لە مێژوو ماونەتەوە، هەموو دڵێك لەم بەهارە بەهەشت ئاسایەدا قوم لە کەوسەر دەدات...

ئەم پێکهاتە نوێیە، لە بەها مێژوویيەکانی خۆمان و شارستانێتی و کلتوور و ڕۆمانتیزمی خۆمانەوە لەدایك دەبێت. بەڵێ، ئەم بزووتنەوەیە، لە لایەك لەو ستەملێکراوی و مەحکومی و بێبەشییەوە کە چەندەها ساڵە یەخەیان گرتووین و لە لایەکیش لەو هەیەجانەوە سەرچاوە دەگرێت کە دڵمانی لە ئیمان سەرشار کردووە.

جێبەجێ بوونی ئەم ئەرکە پڕ بایەخە، سەرەتا و پێش لە هەر شت وابەستەی دینەمۆیەکە کە بتوانێت لەم زەمینە ژەنگاوییەدا ڕۆحە ژەنگ گرتووەکان ببزوێنێت. ئەو پاڵەوانانەی کە ماوەی، پەنجا شەست ساڵە بۆ هێنانەدی ئەم ئەشتەرگەرییە تێدەکۆشن، وا دەردەکەوێت کە یەکەم بزاوتنیان فەراهەم کردبێت. بە گوتەی شاعیرە چلەکێش و خەفەتبارەکەمان بێت دەتوانین بڵێین "فەرهاد! پاچەکەت بوەشێنە! زۆری ڕۆیشتووە و کەمی ماوە!" یەکەم بزاوتن ئەو بزووتنەوەی ڕۆحەیە کە ئەمڕۆ چەشنی ئەرمونیانی سەکینەت و هەورێکی بەهاری و لە شێوەی پەلکەزێڕینەیەکدا، ڕوو لە هەر کوێیەك بکەین سڵاومان لێ دەکات. هیوامان وایە کە ئەمە هەموو وڵاتی ستەملێکراو و مەحکوم کراو و بەشخوراوان بگرێتەوە و لێزمەی ڕەحمەتیان بەسەردا ببارێنێت.

ئەمڕۆ ئیتر وا پێدەچێت وردە وردە "هێز" پاش چەندین توانەوەی زۆر بچێتە قاڵبی "حەق"ەوە و ملکەچی ببێت. بەڵێ، هێزیش حیکمەتێك لە بوونیدا هەیە.. بێ بوونی ئەو چارەسەرکردنی زۆر بابەت مەیسەر نابێت. هەرچەندە ئەو هێزەی کە لە حەق جیادەبێتەوە و ڕێگایەکی پێچەوانەی حەق دەگرێت زیانبەخشە، بەڵام ئەو هێزەی کە لەگەڵ حەق یەکدەگرێت، دەگونجێت وەکو خودی حەق قبووڵ بکرێت. ئەو ئازایەتییەی کە لە ئەنجامی یەکگرتنی هێز لەگەڵ حەقدا دروست دەبێت، ستەمکار نییە، بەڵکو پارێزەری ستەملێکراوانە و زمانێکی گۆیای حەقیشە.

لە بەشی داهاتوودا، بەنیازین ئەم پاڵەوانانەی بزاوتن لە جیهانی ئێمەدا بناسێنین...

# مەردی بیر و بزاوتن

مەردی بیر و بزاوتن ئەو کەسەیە کە: دەجوولێت، نەخشە دەکێشێت، هەمیشە بەدەم خەیاڵی دووبارە بەخشینی ڕێسا و یاسا بە جیهان دەناڵێنێت، نوێنەرایەتیی بزووتنەوەی سەرلەنوێ بنیاتنانەوەی ئەو پەیکەری ڕۆح و مانایەی ئێمە دەکات کە بەدرێژایی چەندین سەدە ڕووخاندبوومان، بەها مێژوویيەکانمان جارێکی تر ڕاڤە دەکات، لە جووڵەوە بۆ بیر و لە بیرەوە بۆ جووڵە، دەزانێت چۆن تانوپۆی ئیرادە و لۆجیك بچنێت و مەردێکی پڕ لە بزاوتنی وایە کە بەگوێرەی قەنەواچەکانی ڕۆح و مەعنای خۆمان نەخشی تەواو نوێ و تازە دەچنێت.

ئەو، لەسەر هێڵێك کە لە هەستەوە بۆ بیرکردنەوە و لەوێشەوە بۆ سەرجەم بوارەکانی ژیانی ڕۆژانە، هەردەم بیر لە ڕێسا دەکاتەوە و هەمیشە بەدەم هەستی ئاوەدانکردنەوە و بنیاتنانەوە هەڵدەستێت و دادەنیشێت. ئەو لەبری بەکارهێنانی هێزی ماددی و فەتح کردنی وڵاتان و بازدان لەم سەرکەوتن بۆ دانەیەکی تر، قارەمانێکی بۆ خوا سوڵحاوی وایە کە سوپاسالارانی ڕۆح و ئەندازیاری فیکر و کرێکارانی هزر پێدەگەیەنێت و هەمیشە بیری ئاوەدانکردنەوە و بنیاتنان بە چواردەوریدا دەپرژێنێت و ڕێگاکانی ئاوەدانکردنەوەی خەراباتەکان نیشانی شاگردەکانی دەدات...

ئەو، هەتا ئەم سەرچاوانەی هێز لە جێی خۆیاندا لە سنووری ڕەزامەندیی خاوەنەکەیاندا بەکاربهێنێت، هەرگیز نادۆڕێت، تەنانەت ئەو کاتەش کە وادەزانرێت دەدۆڕێت، ئەو لە دەستپێکی سەرکەوتنێکی نوێدایە.

مەردی بیر و بزاوتن، جار هەیە ڕۆڵەیەکی بەوەفای نیشتمانە و، جاری وایە بیرمەندێکی خاوەن ڕەهەندی بزاوتنە و، گاهـ عاشقێکی زانستە و، تەنانەت جاری وا هەیە هونەرمەندە و، هەندێك جاریش سیاسەتوانە و، جاری وایشە هەموو ئەمانەیە پێکەوە. لە سەردەمە نزیکەکانی ڕابردووەوە دەکرێت ناوی چەندین مەردی بیر و بزاوتن بهێنرێت کە نموونەن بۆ هەر یەکێك لەو سیفەتانەی لە سەرەوە هێنران. هەندێك لەمانە بیر و بزاوتن تیایاندا هاوشانی یەکن و هەیشیانە مەردی بزاوتنی وان کە بیر تیایاندا حەشاردراوە.

دەکرێت باس لە چەندین سیمای درەخشانی وەك: "ئەحمەد حیلمی" "فلیبەلی" و "مستەفا سەبری" و "فەرید قام" و "محەممەد حەمدی" "یازر" و "حەزرەتی بەدیعوززەمان" و "سلێمان ئەفەندی" و "محەممەد عاکیف" و "نەجیب فازیل"، بکرێت. بەڵام چونکە تەنها هێنانی بەرواری لەدایکبوون و وەفاتی ئەم ناوە موبارەکانە چوارچێوەی ئەم نووسینە تێدەپەڕێنێت، ئێمە لێرەدا تەنها بەوەندە دەوەستین کە ئاماژەیەك بۆ ناونیشانی ئەم پاڵەوانانەی حەقیقەت بکەین.[١]

---

١. نووسەر لێرەدا لەسەر هەریەکێك لەم ناوانە دەوەستێت و کەسایەتییان لە ڕوانگەی بیر و بزاوتنەوە هەڵدەسەنگێنێت. بەڵام لەبەرئەوەی ئەم کەسایەتییانە زیاتر ناوچەیین و کاریگەرییان وڵاتی تورکیای تێنەپەڕاندووە، ئێمە لێرەدا تەنها ئەو بەشەمان وەرگێڕا کە تایبەتە بە زانای پایەبەرزی کورد بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی. بەتایبەت کە بەدیعوززەمان هەم لای خوێنەرانی کورد و هەم لەسەر ئاستی جیهان بەگشتی و دنیای ئیسلامی بەتایبەتی ناسراوە و هەروەها ئەزموون و بیرکردنەوە و بەرهەمەکانی سنووری تورکیایان تێپەڕاندووە و مۆرکی جیهانییان وەرگرتووە.

... ئایا دەکرێت ئەو بەدیعوززەمانەمان یاد نەکەوێتەوە کە بە ئیمان و بیر و بزاوتنە سەرسوورهێنەرەکەی هەموو نەخشە و پلانەکانی جیهانی کوفر و ئیلحادی شێواند؟

هەتا ئەمڕۆ زۆر شت لەسەر ئەو وتراوە و نووسراوە. لە ئێستادا دنیا باسی ئەو دەکات.. وە بە بەرهەمەکانی کە وەرگێڕراون بۆ زۆربەی زمانەکانی جیهان، یەکێکە لە پڕخوێنەرترین کەسایەتییەکانی سەردەم. لەم ڕووەوە پێویست ناکات بە دووردرێژی دەربارەی ئەو قسە بکرێت. لەسەر بنەمای ئەم تێبینییە، بەشێکی کەمی موتالآیەکی کەم دەهێنین کە وەك پێشەکیی یەکێك لە کتێبەکانی ئەو نووسیومانە[1]:

بەدیعوززەمان سیمایەکی پێویستی وایە کە دەبێت بە وردی هەڵوێستەی لەسەر بکرێت و لێکۆڵینەوەی دەربارە بکرێت و بە مرۆڤایەتی بناسێنرێت. ئەو، مرۆڤی ژمارە یەکی سەردەمە کە باوەڕ و ورە و فراوانیی ویژدانی جیهانی ئیسلامی بە ڕوونترین و کاریگەرترین شێوە دەرخستووە. هەڵسەنگاندنی ئەو و بیر و بۆچوونەکانی بە شێوازی عاتفی، مانای یادکردنەوەی ئەو و بەرهەمەکانی ناگەیەنێت. عاتفی بوون، لەگەڵ جددییەتی ئەو بابەتانەدا یەکناگرێتەوە کە ئەو لەپێناویاندا مەردانە خەباتی کردووە و پڕ بەدەنگ هاواری بۆ کردوون. ئەو، هەموو ژیانی وەك مرۆڤێکی خاوەن داوەری لە سایەی قورئان و سوننەت و لەژێر باڵەکانی ئەزموون و لۆجیك و هاوڕێ لەگەڵ عەشق و هەیەجانێکی قووڵدا، بەسەربردووە.

زۆر شت وتراوە و نووسراوە لەسەر سیفەتەکانی بەدیعوززەمان، وەك:

---

١. مەبەست لەو پێشەکییە کە نووسەر بۆ کتێبی (المثنوی العربی النوری)ی بەدیعوززەمان نووسیویەتی.

بیری بەرز و، سادەیی و، فراوانی مرۆڤێتی و، وەفا و، پەیوەستبوون بە دۆستایەتی و، داوێنپاکی و، خۆبەکەمزانین و، بێنیازی و، خاکێتی و، تێرامان لەو ڕۆژگارەی تێیدا دەژیا و، پاشان گوزارشتکردن لێی لە ڕێگەی بەرهەمەکانییەوە. لەڕاستیدا ئەو تایبەتمەندییانەی لە سەرەوە هاتن، هەریەکەیان بە تەنها دەتوانن ببن بە بابەتی کتێبێکی سەربەخۆ و لە کتێبەکانی ئەویشدا کۆمەڵێك باسن کە زۆر لەسەریان وەستاوە. جگە لەوەش، هێشتا لەناوماندا کەسانێکی زۆر هەن کە شادبوون بە بەختیاریی نزیکبوون لەو کاتێك لە ژیاندا بووە و فراوانیی ڕۆح و دەوڵەمەندیی ئەویان لە نزیکەوە ناسیوە. ئەم کەسانەش هەریەکەیان کتێبێکی زیندوون و ڕاستگۆترین شایەتن لەسەر ئەم بابەتە.

ئەو بەدیعوززەمانەی کە ڕوخساری دەرەوەی سادە و ساکار دەردەکەوێت، خاوەنی کەسایەتییەکی هێندە فراوانی وا بووە کە هەم لە ژیانی بیرکردنەوە و هەم لە مەیدانی بزاوتندا وێنە و نموونەی نەبینراوە. ئەو، لە گرنگترین بابەتەکانی پەیوەست بە مرۆڤایەتی باوەشی بە هەموو مرۆڤایەتیدا کردووە و بێزی لە کوفر و ستەم و گومڕایی کردووەتەوە و لە گشت جێگایەکدا جەنگی لە دژی خۆسەپاندن و داگیرکاری ڕاگەیاندووە و تەنانەت لەم پێناوەدا ئەوەندە وەفادار و جوامێر بووە کە ژیانی خۆی بە سووك تەماشا کردووە و بەدەم پێکەنینەوە پێشوازی لە مەرگ کردووە. بەڵێ، هەموو ئەمانە سەبارەت بەو کۆمەڵێك کرداری ئاسایی بوون. لەپاڵ ئەوەدا کە ئەو مرۆڤێکی هەستفراوان بوو، لەو بابەتانەدا کە پەیوەست بوو بە فەرمانبەرییەکەیەوە، هەمیشە خولگەکەی قورئان و سوننەت بووە و ژینێکی ڕەنگین بە داوەری و لۆجیك ژیاوە.

ئەو لەسەر ئاستی هەڵسوکەوتەکانی، هەردەم دوو وێنە و کەسایەتی لە یەك کاتدا پیشانداوە: یەکەمیان وێنەی پاڵەوانێکی ویژدان و تابلۆی عەشق و هەیەجانێکی قووڵ و ڕەنگدانەوەی مرۆڤێکی تابلێی مەردی کێشاوە. دووهەمیان وەکو بیریارێکی وا دەرکەوتووە کە هاوسەنگ بووە و بەجۆرێك دووربین بووە کە زۆر پێش هاوچەرخەکانی خۆی کەوتووە و، خاوەنی بیرێکی هێندە ساغ بووە کە توانیویەتی نەخشە و پڕۆژەی زۆر مەزن بکێشێت. ڕوانین بۆ بەدیعوززەمان و پەیامەکەی ئەو لەم گۆشەیەوە، بۆ تێگەیشتن لەو مانایەی ئەو-وەك بەردەوامیی زنجیرەی گەورەپیاوانی ئیسلام- هەڵیدەگرێت بۆ ئێمەومانانێك کە لەم ڕۆژگارەدا دەژین، یەکجار گرنگە.

ئەگەرچی کەسانێك هەن دەیانەوێت ئەمە نەبینن، بەڵام ڕاستی ئەوەیە کە بەدیعوززەمان لەلایەن هاوچەرخەکانییەوە بە جددیترین بیریار و نووسەری سەردەمی خۆی قبووڵکراوە و توانیویەتی ببێت بە وتەبێژ و ڕابەری خەڵکان، وەلێ هەرگیز خۆی بەدڵ نەبووە و هەردەم خۆی لە ناو و ناوبانگ و دەرکەوتن بەدوورگرتووە. وتەی "ناوبانگ خودی ڕیایە و هەنگوینێکی ژەهراویی وایە کە دڵ دەکوژێت..."، تەنها یەك دانەیە لەو دەربڕینە ئاڵتوونییانەی ئەو لەم بوارەدا. ئەو، لە سەدەی بیستەمی جیهانی ئیسلامی و لەمڕۆشدا لە هەر چوار لای جیهاندا، وەکو یەکێك لە ناوە هەرە دیارەکان ناسراوە و لەلایەن هەموو چین و توێژەکانەوە خۆشویستراوە و بەرهەمەکانی خوێنراونەتەوە و وەکو یەکێك لەو سیمایانەی کە ڕۆژگار نەیتوانیوە کۆنی بکات، بووە بەماڵی مێژوو.

زۆربەی زۆری نووسینەکانی بەدیعوززەمان، لە گۆشەی ئەو ڕۆژگارەوە کە تیایدا لەدایکبووە، دەرەنجامی هەوڵێکی زۆر جددییە لەپێناو ڕاڤەکردنی ئەو بابەتانەدا کە کراوەن بەڕووی ڕاڤەدا. دەکرێت لە بەرهەمەکانی ئەودا هەم ناڵە و هاوار و هەم ئومێد و شەوق و پاراویی ئەنادۆڵ و هەموو جیهانی ئیسلامی ببیسترێت. گەرچی ئەو لە گوندێکی دوورەدەستی ڕۆژهەڵاتدا لەدایکبووە، بەڵام هەمیشە هەستەکانی وەك خەڵکی ئەنادۆڵ بووە و چەشنی خانەدانێکی ئەستەمبوڵ هەستەکانی ئێمەی هەڵمژیوە و هەردەم هاوڕێ لەگەڵ شەفەقەتێکی فراوان و دڵسۆزییەکی بێگەرددا هەموو نیشتمانی لەباوەش گرتووە.

بەدیعوززەمان، لە کاتێکی زۆر چارەڕەشی وادا کە بیری ماددیگەری ژیانی فیکریمانی سەروژێر کردبوو و، کۆمیونیزم سەرشێتانەترین سەردەمی خۆی دەژیا و، جیهانیش ناڕەحەتترین و تاریکترین و سەختترین ڕۆژانی خۆی بەسەر دەبرد.. بەڵێ، لە کاتێکی لەم شێوەیەدا بە خۆی و بەرهەمەکانی کە بۆنی ئیمان و هیوایان لێ دەهات، ڕێگاکانی چەشمەی "خضر"ی پیشانی مرۆڤی ئێمە دا -ئەو مرۆڤەی یەك لەسەر یەك هەژان و ڕووخانی بەخۆوە دەبینی- و بە هەر جێگایەکدا دەگەڕا، نەفەسی "ژیانەوەی دوای مەرگ"ی دەکرد بە بەری حەشاماتەکاندا. ئەو کێشە هەرە گەورەیەی کە پێش هەموومان و پێش هەر کەسێکی تریش هەستی ئەو هەستی پێکرد و هەوڵی چارەسەرکردنی دا، بریتیبوو لەو ئاژاوەیەی کە لە کوفر و ئیلحادەوە سەرچاوە دەگرێت. ئەو، بەدرێژایی ژیانی، پێویستی تێپەڕاندنی ئەم نەخۆشیی سەردەمەی دا بەگوێی مرۆڤی ئێمەدا. وە لەم پێناوەدا هەوڵێکی وای دا کە لە توانا و وزە

بەدەرە. لە بەرامبەر دنیایەکدا کە بەدەم ئازارەوە دەینالاند، بەدیعوززەمان ئاگاداری بەرپرسیارێتییەکانی سەرشانی بوو.. وە کاتێك چووە ژێر بارێکی لەم جۆرەوە کە لە چیای قاف قورستر بوو، تابلێی سادە و خاکی و خۆبەکەمزان بوو. بەڵام بەرامبەر بە قودرەتی بێسنوور و دەوڵەمەندیی ڕەهای خوای گەورە ئەوپەڕی متمانەی هەبوو.

بەڵێ، لەو ڕۆژگارە هەرە ڕەشانەدا کە هەموو خەڵکی بەناوی زانست و فەلسەفەوە بەرەو ئیلحاد ڕاپێچ دەکران و، ژیرییەکان بە کۆمیونیزم دەشۆررانەوە و، ئەوانەی بەم کارەساتە نەگریسانەیان دەوت "بوەستە!" لەم جێ بۆ ئەو جێ شاربەدەر دەکران و، لە گشت گۆشەیەکی وڵاتدا ڕاگواستنی ئابڕوبەر ڕوویدەدا و، لە هەموویشی سەیرتر ئەوەبوو کە تێکڕای ئەم کارەساتانە بە ناوی شارستانێتی و نوێگەرییەوە ڕوویاندەدا و، تەنانەت هیچگەری (Nihilism) کرابوو بە ئەفسانەی سەردەم.. بەڵێ، ئا لەم کاتە شوومەدا، بەدیعوززەمان وەکو پزیشکێکی وردبین زیندانەکانی ناخمان و مەحکومییەتە جۆراوجۆرەکانی ڕۆحمان و تاوانەکانمان و دیلێتیی خۆمانی بیری ئێمە خستەوە و بە بزواندنی لایەنە مرۆییە نووستووەکانمان لە دنیای ڕۆح و ژیانی ویژدانماندا، وای لەو دڵانەمان کرد کە موشتاقی بەرزییەکانن هەناسەی حەسانەوە هەڵبمژن و قووڵاییەکانی ویژدانمانی -کە پەیوەندییان لەگەڵ جیهانەکانی غەیبدا هەیە- خستە پێش چاو و بەجارێك تێکڕای واریداتی تەکیە و خانەقا و خوێندنگا و حوجرەکانی بەسەرماندا باراند.

بەڵێ، لە ڕۆژگارێکی عیفریت ئاسای وادا کە ئوممەت بەدەست هەژاریی فیکرەوە دەینالاند و کێشە کۆمەڵایەتییەکان شێوەی قەیرانی

گەرداوییان وەرگرتبوو و لە هەموو گۆشە و قوژبنێکی وڵاتدا سەدان کارەساتی ترسناك ڕوویاندەدا و لە گشت جێیەکدا بەها ئیسلامی و نەتەوەییەکان بووبوون بە ژێر داروپەردووی کاولکارییەوە.. لە دەمێکی لەم جۆرەدا بەدیعوززەمان بوو بە پزیشکێکی کارامەی وا کە بیری کردەوە و بەدوای چارەسەردا گەڕا و نەخۆشییەکانی دەستنیشان کرد و پاشان ڕەچەتەی بۆ زامەکان نووسی. نەوەگەلێکی بەدبەخت لەژێر باری دنیایەك نەهامەتیدا -ئەو نەهامەتییانەی کە ساڵانی دوورودرێژ و تاریك ئامادەیان کردبوون و هێنابوویانە سەر شانۆ- دەیاننالاند و لە کەندەڵانی بێباوەڕی و گومڕایی و گوماندا سەریان لێشێوابوو و هەر کاتێکیش دەیانویست لێی دەربچن هێندەی تر تیایدا دەچەقین. بەدیعوززەمان وەکو مرۆڤێك کە هەموو ئەمانەی بینیوە و لە قووڵایی ویژدانیدا هەستی پێکردووە، لە یەکەم ڕۆژەوە هەمیشە لێوان لێو لە هەیەجان ژیا.. هەردەم تێڕاما.. چارەسەری بەدیلی پێشکەش بە دەوڵەت و کۆمەڵگا کرد.. وە هەوڵیدا فراوانی و دەوڵەمەندیی جاران بدات بە گوێی ئەم ئوممەتە نەجیب، بەڵام چارەڕەش و ئەم وڵاتە شکۆدار، بەڵام بەدبەختەدا.

بەدیعوززەمان هەر لە سەردەمی عوسمانییەوە زۆربەی زۆری ناوچەکانی وڵات گەڕا، هەر لە گەورەترین شارەکانەوە هەتا چەپەکترین گوندەکان، هەر لە دەڤەرە قەرەباڵغەکانەوە هەتا چۆڵترین شوێنەکان، سەری لە هەموو لایەك دا.. گەیشت بە هەر جێگایەك بینی وا نەزانی فەرمانڕەوایە و، حەشاماتەکان لە دووتوێی هەژاری و پێویستیدا دەتلێنەوە و، بە هۆکاری دووبەرەکیی جۆراوجۆر خەڵکان خەریکن یەکتری دەخۆن. هەربۆیە سڵەمییەوە و تەزوو بە گیانیدا هات.. وەکو بیرمەندێك کە

زۆر باش تێگەیشتووە لەو چەرخەی تێیدا دەژی، تێکۆشا حەشاماتە پەرێشانەکانی ئەو ڕۆژگارە بە ڕۆحی زانست بکوتێت. هەڵوێستەی کرد لەسەر هەژاری و پێویستی و کێشە ئابوورییەکانمان. بەدوای چارەیەکدا گەڕا بۆ ناکۆکییەکانمان و هەمیشە ئامۆژگاریی یەکێتی و یەکڕیزی کردین.. وە هەرگیز و تەنانەت بۆ ساتێکیش میللەتەکەمانی بە تەنها جێنەهێشت. ئەو بە هەر جێگایەکدا تێپەڕیبایە، بە هەموو توانای خۆی هاواری دەکرد و دەیوت "ئەم دەردە یەك لەناو یەکانە ئەگەر ئێستا چارەسەر نەکرێن و زامەکان لەلایەن دەستانی کارامە و پسپۆڕەوە نەپێچرێن، نەخۆشییەکان دەگۆڕێن بە درمی درێژخایەن و شێوەی گانگرین لەخۆدەگرن. پێویستە نەخۆشییە زانستی و کۆمەڵایەتی و ئیدارییەکانمان دەستنیشان بکرێن و دەستبەجێ هەموو کێشە ماددی و مەعنەوییەکانمان چارەسەر بکرێن، تا ڕووبەڕووی ئەو نەهامەتی و نارەحەتییانە نەبینەوە کە بوونمان دەخۆن و مانەوەمان لە ڕەگەوە دەلەرزێنن و هەموو ڕۆژێك بەرەو چاڵێکی ترسناکتر پاڵمان پێوە دەنێن."

بەڕای بەدیعوززەمان سەرچاوەی هەموو خراپکارییەکانی ئەو ڕۆژگارە -هەروەك ئەمڕۆ- نەزانی و هەژاری و دووبەرەکییە. بەڵێ، یەکەم هۆکاری کێشە کۆمەڵایەتییەکان و گرنگترین پاڵنەری ڕەجاڵیی میللیمان نەزانییە. ئەو نەزانییەی کە بە مانای نەناسینی خوا و پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) و بێباکی بەرامبەر بە ئایین و فەرامۆش کردنی دینەمۆ ماددی و مەعنەوییەکانی مێژوومان دێت، بێ هیچ گومانێك دوێنێ و ئەمڕۆش گەورەترین سەرئێشەی ئێمە بووە.. وە بەدیعوززەمان تەمەنی خۆی تەرخانکردبوو بۆ جەنگان لە دژی ئەم

میکرۆبە کوشندەیە. بەڕای ئەو هەتا خەڵکان بە زانست و عیرفان ڕووناک نەبنەوە و کۆمەڵگا ڕانەهێنرێت لەسەر بیرکردنەوەی سیستەماتیکی و ڕێ لە تەوژمە فیکرییە هەڵە و گومڕاکان نەگیرێت، چاوەڕێکردنی هیوای ڕزگاربوون کارێکی بێهودەیە. بەڵێ، مەگەر هەر خەتای ئەم نەزانییە نەبوو کە گەردوون لە قورئان و قورئانیش لە گەردوون دابڕێنرا.. یەکێکیان هەتیو کەوت لە زیندانی خەیاڵی ئەو ڕۆحە دەمارگیرانەدا کە نهێنیی بەدیهاتن نازانن و داخراون بەڕووی شتان و ڕووداوەکاندا. ئەوی تریشیان لەنێو دەستی ئەو نەزانانەدا کە لە ماددەدا بەدوای هەموو شتێکدا دەگەڕێن و بەتەواوەتی کوێربوون لە ئاست مانادا، شێوەی قەیرانێکی وەرگرت. وە ئایا هەر خەتای ئەم نەزانییە نییە کە ئەم جیهانە پیرۆزە سەرەڕای دەشتە هەرە بەپیتەکانی و دەوڵەمەندترین ڕووبارەکانی، کەچی لەنێو چنگی هەژاری و نەداریدا دەناڵێنێت و سواڵ لەوانە دەکات کە تا دوێنێ خۆی خێری پێدەکردن.

ئایا هەر لەبەر ئەم نەزانی و هەژارییە ترسناکە نییە کاتێك لە هەر چوار لای وڵاتدا خێر و بەرەکەتی بێشوماری سەر زەوی و ژێر زەویمان دەڕژێتە خەزێنەی کەسانی ترەوە، ئێمە پەرێشان و دەربەدەر و ڕووت و ڕەجاڵین و پشتمان بە قەرزی بێئەندازە چەمیوەتەوە؟!

بەڵێ، هەر خەتای ئەم بەڵایەیە -ئەو بەڵایەی کە چەندین ساڵە میللەتەکەمانی زەبوون کردووە- کە کرێکار و گوندنشینی بێچارەی ئێمە هەرچەندە هەمیشە ڕەنج دەکێشن و دەپرووکێن، کەچی قەت شتێکیان چنگ ناکەوێت کە لە ئاستی ماندووبوونیاندا بێت و بەری ڕەنجی خۆیان ناخۆن و ئەوەشی دەستیان دەکەوێت خێری لێ نابینن.

هەر خەتای ئەم نەزانی و دووبەرەکییەیە -ئەو دووبەرەکییەی کە لە نەزانییەوە سەرچاوە دەگرێت- کە لە هەموو لایەکی ئەم جیهانەدا و لە دنیایەکدا کە پەیوەندی بە ئێمەوە هەیە "دۆڕانەکان و دیلێتییەکان و ژێردەستەییەکان و چەوسانەوەکان و بەڵا و گرفتە جۆراوجۆرەکان" ڕوودەدەن و تەنانەت خەریکە لافاوی خوێن لاشەکان دەبات و شەرەف لاقە و ناموس پایەماڵ دەکرێت و دنیا لە تۆڕی ناهاوسەنگییەکاندا لێرە بۆ ئەوێ تلێر دەبێتەوە و ئێمەش لە هەمبەر ئەم هەموو کارەسات و ئابڕووچوونانەدا ناتوانین بڵێین ''بوەستە!'' و لە بەرامبەر شۆڕبوونەوەی ڕۆژانەی جیهانی ئیسلام بۆ ناو کەندەڵانی ترسناکتر و گەورەتر، نە چارەسەرێکمان بۆ دەدۆزرێتەوە و نە بە جووتەباڵی یەکڕیزی دەفڕین و نە قسەشمان بەسەر ڕۆژگاری خۆماندا دەڕوات.

کاتێك ئێمە لەنێو چنگی ئەم نەخۆشییە کوشندانەدا دەتلاینەوە، هەندێك لەوانەی لە بەرامبەر پێشکەوتنی ماددی و ڕووکەشی ڕۆژئاوادا چاویان بەر شەوارە کەوت و ڕوانینیان لێڵ و سەریان گێژ بووبوو، لەبری ئەوەی مێشکیان بە زانستە بەسوودەکان و دڵیان لە ڕاستییەکانی ئیمان پڕبکەن و بگەن بە دەوڵەمەندیی ماددی و مەعنەوی، وەك ئەوەی خاوەنی ڕۆح و بنچینە نەبن، بەتەواوەتی چاویان لە ئاست دینەمۆ ئایینی و نەتەوەییەکان نوقاند و بە چاولێکەری و لاساییەکی کوێرانە، عەوامیی خەڵکیان لە خەسڵەتە پەسەندەکانی ئوممەت دابڕی و لە شعووری مێژوو مەحرومیان کردن و بێبەشیان کردن لە ئەخلاق و فەزیلەت. بەڕای من، ئەم دووهەم ڕێگایەی کە بە مەبەستی ڕزگارکردنی ئوممەت گیرایەبەر و ئەم بزاوتنەی دووهەم کە دەست

بۆ داوێنی برا، زیانی زیاتری دا و برینی سارێژنەبووی لە ڕۆحی کۆمەڵگادا هێنایە دی.

لە حاڵەتی یەکەمیاندا مرۆڤی ئێمە بەدرێژایی چەندین ساڵی دوورودرێژ لەژێر کابووسێکی خنکێنەردا ناڵاندی. بەڵام لە حاڵەتی دووهەمدا فەزیلەتی میللی و نەجابەتی ڕۆح و بزاوتنی ستایشکراومان بەجارێك ڕووخا و لەناوچوو.

بەدیعوززەمان سنگی کرد بە قەڵغان لە بەرامبەر چارەسەری هەڵەی هەردوو لایەنەکە و ئەو کێشە و ئاڵۆزییانەش کە لە ئەنجامی ئەم چارەسەرە هەڵانەدا لە بنیاتی کۆمەڵدا سەریان هەڵدا. نەشتەری دا لە زامە دێرینەکانمان و لەپێناو دەستنیشانکردنی ئەو کارەساتانەی کە لە ئەنجامی ئەو هەوکردنانە دروستبووبوون، هەر لە سەرەتای ژیانییەوە هەتا ئەو کاتەی لە شاری ئۆرفە بە مەولاکەی گەیشت، ئەم ڕۆڵە قارەمان و دەنگ دلێر و دڵسۆز و بەجەرگەی نیشتمان، دڵی بەرامبەر بە ئوممەتەکەی سەرشاربوو بە وەفا و هەر هەمان شتی وت و بە هەمان هێز و گوڕ دەستی یارمەتی برد بۆ نەخۆشییەکانمان و هەمان شتیشی وەك چارەسەر پێشکەش کردین. جێکردنەوەی کۆمەڵە بیرێکی نوێ لە دەماغی نەتەوەدا چەند گرانە، هەڵکەندن و لابردنی ئەو تێگەیشتن و جیهانبینیی و ئەو دابونەریت و عادەتەش کە لە ڕابردوو بە میرات ماوەتەوە -ڕاست و هەڵە- و بەدرێژایی چەندین ساڵی ڕەبەق تێکەڵاوی خوێن و دەماری ئوممەت بووە، بەهەمان جۆر سەخت و زەحمەتە. لە دوێنێ و لە ئەمرۆشدا، حەشاماتەکان هەمیشە لەژێر کاریگەریی ئەم جۆرە میراتانەدا بوون -ئیتر سوودبەخش بن یان زیانبەخش- و لەم چوارچێوەیەدا ژیانی

تاکی و کۆمەڵایەتیی خۆیان ڕێکخستووە و بەرامبەر بەو شتانەی کە پێی ڕانەهاتوون یان ئەو بابەتانەی ڕەچاوی هەستی گشتییان نەکردووە، هەستیان بە نەفرەت کردووە و هەوڵیان داوە خۆیانی لێ بەدووربگرن. لەوانەیە هەندێك جار ئەم هەست و ئەم تێگەیشتن و ئەم قبووڵکردنانە هەڵەش بن. ئەگەر ئەم بیر و قەناعەتە چەوتانە بووبن بە موڵکی کۆمەڵگا و هێندە دووبارە ببنەوە کە ببن بە ماڵ بەسەر هەموو چین و توێژەکانییەوە و لق و پۆپ بهاوێت بۆ ناو گشت بوارەکانی ژیان، ئەوا پێویستە لادانەکان لەناو کۆمەڵگادا هەڵبگیرێن و قەناعەتە تۆز لەسەر نیشتووەکان خاوێن بکرێنەوە و بیر و ویژدانەکان خاڵی بکرێنەوە و پاشان بە شتانی نوێ و جوان پڕچەك بکرێن، تا ئوممەت بتوانێت بەرەو داهاتوو هەنگاو بنێت.

بەدیعوززەمان هەر لە ڕۆژانی گەنجێتییەوە هەردەم لەنێو ئەم هەست و ئەم بیرکردنەوەیەدا بوو. ئەو لەم بابەتەدا، شاردنەوەی تەنانەت بچووکترین حەقیقەتی لە وڵاتەکەی و لە مرۆڤەکانی ناوی بە بێوەفایی زانی و لە هەمبەر ئەو بیرە چەوت و ئەو بڕیارە هەڵانەشدا کە ئوممەتیان بەرەو هەڵدێر دەبرد، دەستەکانی وەك مەقەست کردەوە و هەتا هێزی تێدا بوو هاواری کرد "بوەستن! ئەم ڕێگایە داخراوە!" سروشتی ئەو لە بەرامبەر هەڵە و ئەو شتانەدا کە پێچەوانەی بەها ئایینییەکان بوون، تابڵێی توندوتیژ بوو. هەروەها خاوەنی ئاسۆی بەرز و هیممەتێك بوو کە دەکرا نازناوی باشترین شوێنکەوتەی پێغەمبەرە "أولوا العظم"ەکانی لێ بنرێت. چاوداخستن لە ئاستی سڕینەوە و خاپوورکردنی میللەتێکی مەزن، شتێکی پێچەوانەی سروشتی ئەم مەردە شێرئاسایە بوو. ئەو، کەموکورتییەکانی ئوممەت و

هۆکاری کارەساتەکانمانی - تەنانەت قوولْترین و شاراوەترین گۆشەی-
بەجۆرێك نیشان داین کە ڕێگاکانی لەخۆپرسینەوەی لە بەردەم نەتەوەدا
والآ کرد. زوو زوو هۆی دارمانەکانی بیرهێنایەوە و ڕەچەتەی ڕزگاری
خستە بەردەم.. وە تالْترین حەقیقەتەکانی بێ سلْەمینەوە هێنایە سەر
زمان.. ڕووەو قەناعەتە هەلْە و بیرە تۆز لەسەر نیشتووەکان و کوفر و
ئیلحاد شمشێری هەلْکێشا.. وە بەدرێژایی تەمەنی لە هەولْدا بوو لە
دژی ئەو لەمپەڕانەی بەربەستن لە بەردەم بلاوبوونەوەی نوورەکانی
حەقیقەت.

لەو سالْە پڕ لە ئاشوب و کابووسانەدا کە هیچ کەسێك نەیدەوێرا شتێك
بە ناوی ڕاستییەکانی ئایینەوە بلْێت، ئەو هاواری بێدارکردنەوەی گەیاند
بەو حەشاماتانەی دەویسترا خەویان لێ بخرێت.. جاڕی جەنگی لە دژی
نەزانی و هەژاری و دووبەرەکی دا. لە بناغەوە ئەو وەهمە جۆراوجۆرانەی
لەرزاند کە دەوری کۆمەلْگایان دابوو.. هەروەك هێلْێکی بەرگریی لە
دژی بێباوەڕی و نینکاریی خوایەتیی دامەزراند، بەهەمان جۆر ئەفسانە
و شتە پڕوپووچەکانیشی لەناو بێسەروبەرەیی خۆیاندا خنکاند. هەمیشە
بە بوێرییەکی مەدەنییانە کە شایانی سەرسوڕمانە، توێکاری دەردە
درێژخایەنەکانی ئێمەی کرد و ڕێگاکانی چارەسەری نیشان داین. ئەو
وەك ئاسنی سوور -ئەگەر دەربڕینەکە گونجاو بێت- چزا بەو ڕیا و
خۆدەرخستن و عەشقی پلەوپایەیەدا کە یەك دوو سەدە پێوەی گرفتار
بووین. ئەو زۆر شتی نوێی وت کە لە ڕۆحی هەمرواندا و لە دلْی
هەر لە پیاوانی کۆشکەوە هەتا سەرۆك هۆزەکانی ڕۆژهەلات، هەر لە
مەشیخەتەوە تا ئەرکانی سوپا، دەنگی دایەوە.. وتی و سەرنجی هەمور

نەتەوەی بە چینە جیاوازەکانیەوە بۆ لای خۆی ڕاکێشا. هەرچەندە سروشتی ئەو دژی ئەم جۆرە شتانە بوو، بەڵام سروشتی ئەو کارەی پێی هەڵدەستا داخوازی ئەمە بوو.[1]

ئەو یادی هەموو چین و توێژەکانی دەهێنایەوە کە ئەگەر دەمانەوێت بەردەوام بین لە جیهاد، ئەوا دەبێت پێش ئەوەی شمشێر لە کێلان دەربکێشین، سەرەتا پێویستە زنجیری دیلێتیی فیکر و ڕۆحمان بشکێنین.. وە بە مژدەی "زیندووبوونەوەی دوای مەرگ"ەوە ئەو ڕێگایانەی پیشانی نەوەی نوێ دا کە دەگەن بە بیری ئیسلامی. هەرچەندە ئەو لەڕووی جوگرافییەوە لە دابەشبوونی وڵات و پارچە پارچەبوون و بچووکبوونەوەی دەترسا، بەڵام لەمە زیاتر ئەو هۆکارانە خەوی ئەویان زڕاندبوو کە ئەو ئەنجامانە فەراهەم دەکەن، وەك تەسکبوونەوەی بیر و نزمبوونەوەی ڕۆح و چاولێکەری و شوێنکەوتنی کوێرانەی ڕۆژئاوا.

بەدیعوززەمان هەرگیز ماندوو و بێزار نەدەبوو لە هاندان بۆ خوێندنەوە و بیرکردنەوە و کارکردن و ڕزگارکردنی تاکەکانی ئوممەت لە تەنیایی و، هەمیشە لە خەباتدا بوو بۆ گۆڕینیان بە کۆمەڵگایەکی نموونەیی و میللەتێکی ئاوەدان. بۆ گەیاندنی وڵات و مرۆڤی ئێمەش بەم لوتکەیە هەمیشە "پەروەدە و فێرکردن" لەسەر زاری بوو. بڵاوکردنەوەی زانست و زانیاری و پەروەردە و فێرکردن بە هەموو شێوازەکان.. بەڕای ئەو پێویست بوو مزگەوت و حوجرە و قوتابخانە و سەربازگە و کۆڵان و

---

[1]. واتە هەرچەندە سروشتی بەدیعوززەمان ڕقی لە ناو و ناوبانگ و دەرکەوتن و پلەوپایە بوو، بەڵام بەپێچەوانەوە سروشتی ئەو کارەی پێی هەڵدەستا داخوازی ئەوەبوو کە دەربکەوێت و سەرنجەکان ڕابکێشێت و لەبەر خاتری ئەو حەقیقەتەی هەڵیگرتووە، خەڵکان وەك پەپوولەی دەوری چرا لێی کۆببنەوە!

پارك و تەنانەت بەندیخانەكانیش بەشداربن لەم هەڵمەتەدا... چونكە تەنها لە سایەی پەروەردە و فێركردندا دەكرا یەكێتیی عەقڵی و لۆجیكی بهێنرێتە دی. ئەوانەی سەرەتا دەماغیان یەك نەخەن، لەسەر ڕێگایەك و بۆ ماوەیەكی درێژ، ناتوانن پارێزگاری لە پێكەوەبوونیان بكەن. سەرەتا دەبێت ویژدانەكان یەكبگرن، تا یەكگرتنی دڵ و دەستەكانیشی بەدوادا بێت. ڕێگای یەكگرتنێكی لەم شێوەیەش ئەوەیە كە ژیان بەگوێرەی دەستووورە ئایینییەكان هەڵبسەنگێنرێت و ئەو شتانەش كە پابەندی كات و چەرخن -بەمەرجی ڕەچاوكردن و پاراستنی قورئانی پیرۆز و ئیجتیهادی پاكی پیاوچاكانی پێشین- لەژێر ڕۆشنایی تێگەیشتن و هەلومەرجی سەردەمدا ڕاڤە بكرێن.

بەڵێ، پێویست بوو مرۆڤی ئێمە لەم ڕۆژگارە و واریدات و مانا و تەفسیرەكانی تێبگات و لەگەڵی ئاشت ببێتەوە و هەڵبكات. كاتێك دنیا لە حاڵەتی پێشكەوتندایە، خزانە ناو قاوغی خۆمان و گرتنی كونجی خەڵوەت، ئێمە دەكوژێت. ئەوانەی دەیانەوێت لەمڕۆدا بژین، بێگومان ناچارن گونجان و تەباییەك لەنێوان شەپۆلەكانی ژیان و، ئیرادە و هەوڵ و تێكۆشانی خۆیاندا بسازێنن. ئەگینا دژایەتیكردنی شەپۆلی گشتیی ژیان، بە تیاچوونی ئەوان كۆتایی دێت.

ئەگەر ئەو كاتەی بەدیعوززەمان بە هەناسەبڕكێ پەیامەكەی بە هەر چوارلای وڵاتدا بڵاودەكردەوە، لە بیر و بۆچوونەكانیدا چەند سەد ڕۆشنبیرێك هەبووبان كە لێی تێبگەیشتنایە و یارمەتییان بدایە، ڕەنگە ئەمڕۆ لە دەوڵەمەندترین وڵات دەوڵەمەندتر و لە پێشكەوتووترین وڵات پێشكەوتووتر بووبایەن و بە دەستخستنی هێزێك كە سەرمان بخات بەسەر

گشت ئاستەنگەکاندا، دەمانتوانی ئەو ڕێگا ڕووناکەی کە هەنووکە وا پێدەچێت پێمان تێنابێت، سەدەیەك پێش ئێستا هەنگاومان تێدەخست و لەوانەیە ڕووبەڕووی زۆرێك لەو کێشانە نەبووینایەتەوە کە ئەمڕۆ گرفتارین بەدەستیانەوە.. بەڵام دیسان و سەرەڕای هەموو شتێك هیوامان بەهێزە. من ئەوانە بە نەزان و بێئاگا دەزانم کە لافی وشکبوونی تەواوەتیی ڕەگەکانی مەعنای ئوممەتی ئێمە دەکەن. گەرچی وەکو ئوممەتانی تر ئێمەش دووچاری کەوتن بووینەوە، ناکرێت ئینکاریی ئەم ڕاستییە بکەین. بەڵام کەسیش ناتوانێت بانگەشەی ئەوە بکات کە ناتوانین هەستینەوە و بێینەوە سەر خۆمان. هەنووکە وەکو ئوممەتی، لە جێگەی حەزکردن بە حەوانەوە و پاڵدانەوەکەی جاران، نووری بێداری و وریایی دەدرەوشێتەوە.. لە ڕۆحە لەرزۆکەکانماندا زیندووییەکی تازە و گەرمیی نوێبوونەوە هەیە.. گومانی تێدا نییە کە ئەم پێشهاتانە بەدوایاندا ڕۆژانی بەهاری شیرین دێن. بەڵام چاوەڕێی ئەو "خضر"انەین کە لە بنارماندا بەرماڵ ڕادەخەن و چاو لەڕێی ئەو "ئیلیاس"انەین کە چاونەترسانە چارۆکە بەڕووی دەریا فراوانەکاندا هەڵدەکەن. لەم بابەتەدا بەدیعوززەمان ئاماژەیەکی گرنگە...

واتە بلیمەت ناڵێت با ئەمە بکەم و ئەوە نەکەم، هەروەها بڕیار لەسەر کردن یان نەکردنی شتێك نادات لەسەر بنەمای هەڵسەنگاندنی سوود و زیان. بەڵکو ئەو وەك سەرچاوەیەکی هێزی فرەبەهرەی وا کە هاوڕێ لەگەڵ بەخششی خوایی و هەستی پاڵنان (سائقة)ی لەددوننی، هەموو قووڵترین و گشتگیرترین پێداویستییە دەرەکی (ظاهري) و ناوەکی (باطني) و ڕۆحی و کۆمەڵایەتییەکانی دەوروبەری لەباوەش دەگرێت

و سروشتێکی دانسقەی وایە کە هێزی هەڵگرتنی زۆر شتی جیاوازی لە ڕۆحی خۆیدا جەم کردووە. ئەوانەی سەرنج لە بەدیعوززەمان و ئەو بەرهەمانە دەدەن کە لە دوای خۆی بەجێی هێشتوون، لەودا هەموو جۆر و بابەتەکانی بلیمەتی (دهاء) دەبینن. ئەو، هەر لە بەرهەمەکانی سەردەمی لاوێتییەوە کە بە یەکەم هەناسەکانی بلیمەتی ئەژماردەکرێن و پێشکەشی چواردەورەکەی کردووە، هەتا بەرهەمەکانی تافی پێگەیشتوویی کە لە ژیانی چەرمەسەریی نێو دادگا و زیندان و مەنفاکاندا وەك گوڵێك پشکوتوون، هەردەم پارێزگاری لە هەمان ئاستی سەرسووڕهێنەر کردووە و هەمیشە گوتاری بلیمەتانەی بێژاوە.

# بەرەو دنیای خۆمان

کاتێك لەسەر ڕووداوە مێژووییە مەزنەکان هەڵوێستە دەکەین، دەبینین بیر و بزاوتن تیایدا شان بە شانی یەك بوون. هەماهەنگییەك بە مانای لە لایەك بەخێوکردن و بەرنامەڕێژی کردنی بزاوتن لەلایەن هزرەوە و، لە لایەکی تریشەوە سازاندنی زەمینە بۆ بیر و پرۆژەی نوێ لەلایەن بزاوتن و هەڵمەتەوە. لەم ڕووەوە دەکرێت هزر سەبارەت بە بزاوتن بە ئاسمان و باران، بە فەزا و هەوا بچوێنرێت، هەروەها بزاوتنیش سەبارەت بە هزر وەك زەمینە و ئینجانە، وەك خاك و ئەو توانای ڕواندن و سەوزکردنە وا بێت کە لەخۆیدا هەڵیگرتووە. بەڵێ، پێدەچێت قبووڵ کردنی ئەم ڕووکردنە یەك و ئەم بەدەمەوەچوونی یەکترە شتێکی هەڵە نەبێت. چونکە هەر هەڵمەتێك جێبەجێبوونی نەخشە و بیرێکە و هەموو هزرێکیش سەرەتایەکە بۆ دۆزینەوەی چوارچێوەی ڕاستەقینەی خۆی و گەیشتن بە ئامانجی خۆی بە هاوکاریی ئەو بزاوتنانەی خاوەنی هەمان ئاڕاستەن. یەکەم پلەی ئیرادە مەیلێکی ناوەکییە و سنووری کۆتاییەکەشی بڕیار و خۆیەکلاکردنەوە و دەستپێکردنە. لەم دەستپێکەدا بیر وەك تاڵەکانی چنینێك

وان لەنێوان سەرەتا و کۆتاییدا، جوولە هۆشیارانەکانیش وەك ئەو نەخشانە وان کە لەسەر ئەم چنینە دەنەخشێن. ئەو هەڵسوکەوتانەی بیریان لێ نەکراوەتەوە و نەخشەیان بۆ نەرێژراوە زۆربەی جار بە شکست و ئاڵۆزی کۆتایی دێن، بیرە نەبزۆك و نەجووڵاوەکانیش ڕێگە لە دروستبوونی نموونە و مۆدێل دەگرن -کە بە ڕەهەندی کۆتایی بیر دادەنرێن- و ڕۆحی ئیرادە زامدار دەکەن.

لەگەڵ نزیکبوونەوە لەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆدا، هەروەك ڕێ گیراوە لەوەی تیشکەکانی بیر هەموو لایەکی کۆمەڵگا بگرنەوە، ئیرادەش بەتەواوەتی ئیفلیج خراوە.. لەخۆداجێبەجێکردن و نوێنەرایەتیکردنی حەقیقەتەکان ڕەهەندە کران و، بزاوتنیش بە دەستی ئاژاوە و ئاڵۆزی کوژرا. شەپۆلە بەدبەختەکانی سەردەم زۆربەی جار حەشاماتەکانیان لەم قەیرانەوە بۆ ئەو قەیران و لەم ئاشوبەوە بۆ ئەو ئاشوب دایەبەر. چینەکانی خەڵك لە دەستی کەسە هەڵپەکار و خۆپەرستەکاندا سەرگەردان و سەرسووڕماو مایەوە و جارێك بۆ ئەم لا و جارێك بۆ ئەو لا کێشکرا، بەڵام هەمیشە خەڵەتێنرا و کەڵکی خراپی لێ وەرگیرا. بۆیە دەبینین مرۆڤی ئەمڕۆ هێشتا بە ئەندازەی ئەوە پێنەگەیشتووە کە هێزی دڵ و زیهنی بەرامبەر ئەم هەموو کێشە و گرفتانە بخاتە گەڕ و دەڵێین "دەی ؤزێکی تریش!".. هەمان شتیش دەڵێین بۆ ڕەواندنەوەی لاوازیی توانا و ێهاتنە کەسییەکانمان، پێگەیاندن و بەرزکردنەوەی باوەڕمان، ڕیشەکێش ردنی هەموو جۆرەکانی نائومێدی لە ڕۆحماندا. بێگومان پێش لە هەر ەتێکی تریش "دەی تۆزێکی تریش!" دەڵێین بۆ ڕزگاربوون لە حاڵەتی ۆك بوون بەرامبەر بە ڕۆژئاوا...

بەڵێ، لە شۆڕشی پیشەسازیی ڕۆژئاواوە هەتا پێشکەوتنە تەکنەلۆجییەکانی ئەمڕۆ، هەروەك بە نزیکەیی هەموو شتێك کاریگەریی شۆك لەسەر شۆکی لەسەر ئێمە هەبوو و ئەژنۆی ئیرادەمانی شکاند، بە هەمان جۆر تێگەیشتنی هەڵە دەربارەی زانستیبوون و وروژاندنی هەوا و ئارەزووەکان لەلایەن مۆدێرنیزمەوە زۆر سەری گێژکردین و چاومانی بەر شەوارە خست. پێدەچێت ئەم هەژان و لاوازییە ماوەیەکی تریش بەردەوام بێت.. ئەم وڕێنە و بەدەم خەوەوە ڕۆیشتنە بەردەوام دەبێت و مەگەر خوا بۆ خۆی بزانێت پێویستە چەند ساڵی تریش دان بەخۆماندا بگرین. سەبر دەگرین، چونکە دەزانین بێداربوونەوە و تیماربوونی ئەم جەستە گشتییەی کە تەواو ماندوو و لەرزۆکە، چەندین ساڵی دەوێت و دەزانین کە پێویستمان بە چاوەڕوانییەکی زیندوو هەیە بە ئەندازەی قووڵیی مەرجان، پێویستمان بە جووڵەی چالاك و نەخشە بۆداڕێژراویش هەیە وەك ئارامگرتنی مریشکی کڕکەوتوو لەسەر هێلکەکانی.

باوەڕی تەواوم هەیە بەوەی لە سایەی ئەم چاوەڕوانیی و بزاوتنەدا بێگومان ڕۆژێك ئێمەش زیندوودەبینەوە و سیمای جیهان دەگۆڕین. بەڵام ئەوەندە هەیە بۆ شکاندنی ئەو شەپۆلی قەیرانانەی کە چەندین سەدەی ڕەبەق هەست و بیر و فیراسەتی مرۆڤی ئێمەیان شکاند و بۆ هەڵکردنی نەسیمی "جودی" لە ڕۆحیدا، پێویست بە کات و زەمینە و ئامراز و کەلوپەل دەکات. پێویست بە پێگەیشتنی ئیرادەگەلێکی بەهێز و مەزنی وا دەکات کە هاوڕێ لەگەڵ قووڵی "شاهی گەیلانی" و فراوانیی "ئیمامی غەزالی" و ڕەببانییەتی نوێکار (مجدد)ی هەزارەی دووهەم و عەشق و هەیەجانی "مەولانای ڕۆمی" و، گشتگیری و

دووربینیی "بەدیعوززەمان"، تا بتوانن ڕۆحێکی تازە بە مرۆڤی ئەمرۆمان ببەخشن و زەمینەی ژیانێکی نوێی بۆ بڕەخسێنن.. هەروەها بێگومان پێویستمان بە فەتح کردنی خۆمان و سەرلەنوێ بنیاتنانەوەی میکانیزمی ڕۆحمان و نۆژەنکردنەوەی دنیای دڵ و هەست و بیرمان دەبێت.. ئەگینا بەپێچەوانەوە هەتا ئەو سوارچاکە ڕووناکانە پێنەگەیەنین کە دەمانگەیەنن بە سەرچاوەی "خضر" و تا داخراو بین بەڕووی خۆمان و بەهاکانماندا و تا لەسەر ئاستی سیستەمی ڕۆحمان شپرزە و شێواو بین، هەرگیز ناتوانین ڕێگا ببڕین، هەروەك تا ئەمڕۆش نەمانتوانیوە. لەم بابەتەدا پێویست ناکات لە دەرەوە بەدوای دوژمندا بگەڕێین، چونکە دوژمنی ئێمە لە ناوەوەیە و قاچی ناوەتە سەر قاچی و لە پەنجەرەی ڤێلاکەیەوە تەماشای دەربەدەریی ئێمە دەکات و پێدەکەنێت.

ئەگەر لەم گۆشەیەوە بەحەتمی پێویست بە دانانی ستراتیژێك بکات بۆ جیهاد، ئەوا پێویستە ئەم ستراتیژە بە ئاڕاستەی ڕیشەکێش کردنی ئەم دوژمنە بێباوەڕ و دڕندانە بێت کە لەسەر تەختی دڵمان دانیشتوون. لەڕاستیدا دنیای ئێمە بەدرێژایی چەندین سەدە لەژێر ئابلۆوقەی ئەم دوژمنانەدا بووە، نەك هەر شتێکی تر. ماوەی چەندین ساڵی دوورودرێژ ئوممەتەکەمان نەیتوانی لەم ئابلۆوقە بکوژە ڕزگاری بێت و بێتەوە سەر خۆی.. ببێت بە خۆی.. هەردەم وەك چەقی تیشکۆی کۆمەڵگە جۆراوجۆر و دابونەریت و عادەتە جیاوازەکان، هەمیشە وەك بیرزەدەیەك کە لە یەك کاتدا چەندین بت دەپەرستێت و لە یەك ساتدا کڕنووش بۆ چەندین خوای وەهمی دەبات و ڕۆژانە عەهد و پەیمان لەگەڵ چەندین پەرستراوی ساختە نوێ دەکاتەوە. بەم جۆرە هەمیشە وەك

نموونەی پەرێشانی و شپرزەیی دەرکەوت و نەیتوانی خۆی کۆبکاتەوە. چونکە ئەو لەم سەردەمە شوومەدا باوەڕی بە ڕاستی و تەواویی هیچ بیرێکی دیاریکراو نەکرد و لەبەرئەمەش، هەرچەندە لە پەراوێزی چەندین تەوژمی فیکریی جیاوازدا ژیانی بەسەربرد، بەڵام بە تەواوەتی لە هیچ یەکێکیاندا خۆی نەبینییەوە.

کێ دەزانێت لەم دنیا تەمومژاوییەدا چەند بیری گەورە لە بەرزەخدا مانەوە و دەرفەتی هاتنە ژیانیان بۆ نەڕەخسا و چەند پرۆژەی جددیش بەر ئەم بینینە لێڵەی چاوە کزەکان کەوت و شکا! بەڵێ، بەرای ئەمانە زانست و پەیوەندیی نێوان مرۆڤ-گەردوون و ئەو مانایەی لەنێو دێڕەکانی ڕووداو و بوونەوەراندا حەشاردراوە، شتانی بێمانان و گرنگ نین و پێویست ناکات هەڵوێستەیان لەسەر بکرێت. بە قسەی ئەمان بێت، ئەوەی دەربارەی بوون دەیزانین دەیزانین، ئەوەشی نایزانین خۆ سبەی هەر فێری دەبین. بەم جۆرە ئەم بابەتانە دەخەنە دەرەوەی چوارچێوەی توانای زانینمان و ئیتر دەتوانین هەموو شتێك بەگوێرەی جێگیر (ثوابت)ەکانمان چۆن پێمان خۆش بوو ببڕین و بدوورین و ئەگەر پێویستی کرد دنیایەك هەڵە بە ڕاست و ڕاستیش بە هەڵە نیشان بدەین و گوایە دەتوانین بە ئاسانی لەژێر سایەی بیروباوەڕ و دۆگماکانماندا درێژە بە زانست و لێکۆڵینەوەی زانستی بدەین! وەك بڵێی شایەتحاڵی سەرەتای بوون و ئەو لاپەڕەی ڕووداوانە بووبێتین کە بەسەریدا گوزەری کردووە و ئنجا هاوڕێ لەگەڵ بەکارهێنانی زمان و شێوازێکی لەخۆدڵنیا و سەد دەر سەد و بە چەند بیردۆزێکی لار و چەوت، هەموو شتێك شیتەڵ بکەین و بیگەیەنین بە ئەنجام!

ئەگەر لە گەردووندا هیچ حەقیقەتێك بوونی نەبێت تا مرۆڤ باوەڕی پێ بکات و هیچ بیر و بۆچوونێکیش شایانی قبوولکردن و باوەڕهێنان نەبێت، ئەدی بوون چ جیاوازییەکی لەگەڵ بێسەروبەرەیی و ئاژاوەدا هەیە؟ لە دنیایەکدا کە تێگەیشتنێکی لەم شێوەیە باڵادەستە، چۆن دەکرێت تەنانەت لە ئاساییترین بابەتدا کۆمەڵگا لە ڕێژەگەرایی ڕزگاربکرێت؟ ئایا ئەو حەشاماتانەی خۆیان لە باوەشی ڕێژەگەرایی هاویشتووە، تەنانەت ڕاسترینەکانیش بە ئەندازەی ڕاستێتیی دژەکانیان و هەڵەترینەکانیش بە ئەندازەی هەڵەی دژەکانیان قبووڵ ناکەن؟ تەشەنەسەندنی وەها جیهانبینییەك وا دەکات هەر لە بۆچوونی چاکە و خراپە هەتا تێگەیشتنمان لە ڕەوشتی و ناڕەوشتی بەشی خۆی لە ڕێژەگەری وەربگرێت. ئەو کەسایەتییەی ئەمڕۆ وەکو ئوممەت لە هەر شتێکی تر زیاتر پێویستمانە، کەسایەتیی مرۆڤێکی دڵسۆز و حەماسی و هاوسەنگە کە شعوور و هەست و لێپرسراوێتی دەیخاتە کار و لە نەخشە و پڕۆژەکانیدا، بیرکردنەوە لە ڕۆژانی داهاتوو بە ئەندازەی بیرکردنەوە لە پێداویستییەکانی ئێستا، زاڵە. کەسایەتییەکی وا کە دڵی کراوەیە بەڕووی بووندا و مێشکی بە شعووری زانست ئاوەدانە و دەزانێت چۆن هەموو ساتێك خۆی نوێ بکاتەوە و هەمیشە پەیڕەوی لە ڕێسا و ڕێکوپێکی دەکات و هەموو چرکەساتێکیش کاولکارییەکی تازە نۆژەن دەکاتەوە.

ئەو، هەردەم لەم سەرکەوتن بۆ ئەو سەرکەوتن دەڕوات، بەڵام نەك ئەوەی وڵاتان وێران بکات و پاشان لە مەملەکەتە خاپوورەکاندا پایتەخت بنیات بنێت، بەڵکو بۆ بزواندنی هەست و مەلەکە مرۆییەکان و بەهێزکردنی

خۆشەویستی و جوامێرییەك کە هەمووومان و هەموو شتێك باوەش دەکات و ئاوەدان کردنەوەی نیشتمانە ڕووخاوەکان و بەخشینی نەفەسی ژیان بە مردووەکان و بوون بە خوێن و گیان و ڕژان بەنێو موولوولەکانی بووندا و گەیاندنی چێژی فراوانی بوون و ژیان بە هەموومان.. خۆی لە خۆیدا ئەو بە هەموو شتێکییەوە پیاوی خوایە.. وە هەمیشە وەك خەلیفەی ئەو پەیوەندی لەگەڵ بووندا هەیە. هەموو جووڵە و چالاکییەکی هاوسەنگە و بەجۆرێك ورد و درشتی کارەکانی ڕاپی دەکات وەك ئەوەی لەلایەن ئەوەوە پشکنینیان بۆ بکرێت. بە ڕوانینەکانی ئەو دەبینێت.. شێواز و ئوسلوبی خۆی لە گوفتاری ئەوەوە هەڵدەبژێرێت.. وە لە بەرامبەر ئیرادەی ئەوەوە وەك "مردووی بەردەم مردووشۆر" وایە.. هەستکردنی بە کۆڵەواری و هەژاری خۆی لە بەرامبەر خوای خۆیەوە، سەبارەت بە ئەو گەورەترین سەرچاوەی هێز و سەروەتە. ئەو هەمیشە هەوڵ دەدات هەرگیز کەمتەرخەمی نەنوێنێت لە بەکارهێنانی ئەم گەنجینەیە بە باشترین شێوە.

ئەو، لە هەمان کاتدا مرۆڤێکی چاودێرە بەسەر نەفسی خۆیەوە. لە ئاوێنەی ڕۆحی ئەودا چاك و خراپ، جوان و ناشرین، هەمیشە وەك جیاوازیی نێوان تاریکی و ڕووناکی لە یەك جیان و هەموو شتێك لە جێی تایبەتی خۆیدایەتی.. ئەو بە ئیرادە و دڵ و شعوور و هەستی، بەدوای ڕاوکردنی ئەو ئامانجە هەرە مەزنانەدا وێڵە کە لەسەر ویژدان و لایەنە ناسکەکانی تری مرۆڤ دەنیشنەوە..

ئەو، لەسەر ئاستی ژیانی کەسی هەمیشە چاوی لە ئاسۆی بوون بە مرۆڤی نموونە بڕیوە.. لە جێبەجێکردنی فەرمان و نەهییەکاندا هێندەی

ئەولیا و ئەصفیاکان جددی و هەستیار و وردبینە.. لە هەوڵەکانیدا بۆ زیندووکردنەوەی ژیانی موسڵمانانەی ڕاستەقینە و لە هەڵوێستەکانیدا لە هەمبەر ئەو شتانەوە کە خوا خۆشیناوێن و لە بێباکییەکەیدا بەرامبەر بە هەموو ئەو دەرەنجامە خراپانەی دەکرێت بەهۆی پەیڕەوکردنی بیروباوەڕییەوە بێنە ڕێی، خۆڕاگری و ئازایەتییەکەی ئەو لە سەروو هەموو تەسەوور و خەیاڵێکەوەیە. بە تایبەت دەربڕینەکان دەستەوەستانن لە وەسف کردنی لێبووردەیی ئەو لە هەڵسوکەوتەکانیدا لەگەڵ خەڵکدا و قووڵبوونەوەی لە مەعریفەتی خوادا و ئەو عەشق و شەوق و پەیوەندی و نیگەرانییەی کە لەبەر خاتری خوا بۆ هەموو بوون هەڵیگرتووە.

خۆی لە خۆیدا ئەو، پێش لە هەر شتێکی تر، مرۆڤی مەعریفەتی لەددونێی و وەزیفەیە. ئایا چۆن لە مرۆڤی لێپرسراو لە وەزیفەی لەددونێی تێدەگەین، ئەمەش شایانی هەڵوێستە لەسەرکردنە...

# ئەندازیارە ڕەببانییەکانی ڕۆح

ئەگەرچی لەم ڕۆژگارەماندا کەسانێك هەبن کە گاڵتەیان بێت بە بەها ڕەوشتی و قووڵیی ناوەکیی مرۆڤ و گرنگیی ژیانی دڵ و ڕۆحی، بەڵام هیچ گومانێك لەوەدا نییە کە ڕێگای گەیشتن بە مرۆڤایەتیی ڕاستەقینە هەر بەمانەدا تێدەپەڕێت. شێوازی تێگەیشتنی هەندێکمان هەرچۆنێك بێت، تەنها بە بەگەڕخستنی هەمان ئەم دینەمۆیانە لە ژیانی ڕۆژانەدا دەتوانرێت مرۆڤی ئەمڕۆمان لە قەیران و ناڕەحەتییە یەك لەسەر یەکەکان ڕزگاربکرێت. ئەم مرۆڤەی کە بە گەرداوە جۆراوجۆرە کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی و ڕۆشنبیرییەکان پشتی چەمیوەتەوە و ناچاری هەڵگرتنی چەندین قەمبووری سەخت بووە لەسەر کۆڵی. هێنانەدی ئەم ئەرکە هەرە گرنگەش تەنها بەو ڕەببانییانە دەکرێت کە هەرگیز بیر لە خۆیان ناکەنەوە و ئەگەر بیریشی لێ بکەنەوە، ڕزگاربوونی خۆیان لە ڕزگارکردنی کەسانی تردا دەبیننەوە.

بەڕای ئێمە -هەڵبەت مەبەستم لە موسڵمانێتیی ڕاستەقینەیە- ڕزگاربوون لە لای خوا، بەندە بەو هەوڵ و تێکۆشانەی لەپێناو

ڕزگارکردنی بەندەکانی ئەودا دەدرێت. ئێمە هەموو کاتێك سەلامەتیی داهاتووی نزیك و دوورمان لەوەدا دەبینینەوە کە ببین بە پەناگە بۆ ڕۆحەکانی دی و بە ترومپای نوور بۆ ئیرادەکانی تر و هەمیشە دەمانەوێت لەناو ئەو کەسانەدا شوێنی خۆمان بکەینەوە کە سنگیان لە بەرامبەر ئاگر دەکەن بە سەنگەر و پشتیان لە بەرژەوەندییە کەسییەکان کردووە. خۆی لە خۆیدا ئەخلاقیبوونی ڕەفتار و هەڵسوکەوتەکانمان، پەیوەندییەکی نزیکی بەم هەستی لێپرسراوێتییەوە هەیە کە لە ڕۆحماندا وەك بیرێکی بنەڕەتی بالآی کردووە.

بەڵێ، ڕۆحی بەرپرسیارێتی و عەزمی هیممەتێکی مەزن و ئیرادەی ڕێنموونیکردنێکی لەم جۆرەیە کە گرنگترین تۆوی ئەو ڕێسایەیە کە هەموو بوون لەباوەش دەگرێت و، بە گەورەترین کانگای ئاشتی جیهانی ئەژمار دەکرێت و، هەمیشە سنووری تاکێتیمان دەبەزێنێت و، هەم تاکە بناغەی ڕزگاربوونی ئێمەیە و، هەم ئەو کاریگەرترین دەنگ و گۆیاترین زمانەیە کە ئەو ڕۆح و مانایە دەچێنێت بە گوێی مرۆڤایەتیدا کە ئاتاجیەتی.

هەرگیز ڕزگاربوونی ئەوانە نەبینراوە کە پشتیان لە بوونی هەمەکی و ڕێسای گشتی هەڵکردووە و تەمەنیان لە داڵانە تاریکەکانی خۆپەرستیدا بەسەربردووە. نەك هەر ڕزگاریان نەبووە، بەڵکو زۆر جار کەسانی لەم جۆرە، بوون بە هۆکاری لەناوچوونی ئەوانەش کە گومانی باشیان پێیان هەبووە. ئەو سەردەمانەش کە مرۆڤایەتی تیایدا بەرەو پێش چووە، هەمان ئەو کاتانە بوون کە دەستی لەناو دەستی هەموو بوون و بوونەوەران کردووە. ئەمێستاش ئەوانەی نەخشەی ڕۆیشتن بەرەو داهاتوو لێ دەدەن،

پێویستە لەگەڵ هەموو کەس و گشت شتێکدا دەستلەملان بن. ئیرادە و ئامانجە باڵاکان تەنها ئەو کاتە نرخی ڕاستەقینەی خۆیان دەدۆزنەوە کە هاوکاریی شعووری گشتی و خەباتی دەستەجەمعی بەدەست بهێنن. لەڕاستیدا تاقە ڕێگای گۆڕان لە دڵۆپەوە بۆ دەریا و لە تاکەوە بۆ کۆمەڵ و گەیشتن بە نەمری بریتییە لە ژیاندنی کەسانی تر و ژیان لەگەڵیاندا و توانەوە لە ناویاندا.

بە واتایەکی تر، بۆئەوەی مرۆڤ ببێت بە مرۆڤی ڕاستەقینە، سەرەڕای جەستە و جیسمانییەت و "عەقڵی مەعاشی"یەکەی، پەیوەستە بەوەی لەژێر فەرمانی دڵیدا بێت و گوێ لە دەنگی ڕۆحی بگرێت. واتە مرۆڤ بۆئەوەی خۆی و چواردەورەکەی باشتر بناسێت، مەرجە بە چاوی دڵ لە هەموو کەسێك و هەموو شتێك بڕوانێت و لە ڕوانگەی پێوەرە نرخشناسەکانی دڵەوە هەڵیانبسەنگێنێت. نابێت ئەوە لەبیربکرێت ئەگەر کەسێك هەمیشە نەتوانێت ڕوونیی ڕۆح و تازەیی دڵ بپارێزێت و هاوڕێ لەگەڵ دەوڵەمەندیی زیهنی و فیکری و هەستدا هێندەی منداڵان پاك و بێگەرد نەمابێتەوە، زانست و ئەزموون و جیهانبینیشی چەند فراوان بێت، هەرگیز ناتوانێت دڵنیایی ببەخشێت بە دەوروبەرەکەی. لەبەر ئەم هۆیەیە کە خەڵکی عەوام متمانە بەو سیاسیانە ناکەن کە هێز و زەبریان پێش لۆجیك و داوەریی ژیرانە و دڵ خستووە، جگە لەوانەی کە ترساون یان سەرکوت کراون و خۆیان وا دەردەخەن کە باوەڕیان هەیە. ڕۆحە پاك و دڵە بێگەردەکان هەمیشە شوێنی بیرە خاوێن و ڕەفتارە دروستەکان کەوتوون. بەڵێ، ئەو دڵە پاکانەی توانیویانە بێگەردیی خۆیان بپارێزن، وەك لە فەرموودەیەکی پیرۆزدا ئاماژەی بۆ کراوە، وەك خانەی خوای

گەورەن و چەشنی گەنجینەیەك ئەویان لەخۆداهەڵگرتووە.[١] ئەم خانەیە، بە ئەندازەی پاکی و ئاسمانیبوونی ڕەهەندەکانی تایبەت بە ئەودیو، تێیدا ڕاستییەکانی پەیوەست بە لاهوتی پەتی بێ چەندێتی و چۆنێتی هەستیان پێدەکرێت. ئەم ڕۆحە خاوێنانەی کە لە سەروو کاتەوەن، هەر لە دنیادا و بە یارمەتیی ئەو تۆوی "تووبای بەهەشت"ەی کە تیایاندایە، دەگەن بەو فیردەوسەی کە کەسانی تر ڕەنگە لەو دنیادا پێی بگەن و لە گەردیلەیەکدا تەماشاکردنی خۆری مەزنیان بۆ ئاسان دەبێت.

لەڕاستیدا ئەمە هەمان ئەو "مرۆڤە دڵ بێدارە"یە کە قورئان و خاوەنی قورئان بۆمان باسدەکات. پاڵەوانێکی حەقیقەتی وا کە بە سەرجەم بەهرەکانی ویژدانی دەبینێت و، بیردەکاتەوە و، ڕەفتاردەکات و، هەستان و دانیشتنی ڕەحمەت و، وتە و گوفتاری نەرمونیانی و، هەموو حاڵەتێکیشی نەزاکەت و ناسکییە. قارەمانێکی وا کە نهێنی ناسینی بوون و هەست پێکردنی دەدات بە دەستەوە و دەتوانێت واتا و مەبەستی ڕاستەقینەی ژیان بهێنێتە سەر زمان. ئامانجی باڵای ڕەببانییەکی لەم جۆرە بریتییە لە گەیاندنی هەموو خاوەن ڕۆحێك بە ئەبەدییەت و پێشکەش کردنی ئیکسیری نەمری بە هەمووان. ئەو، هەم لە قووڵاییەکانی ناخیدا و هەم لە جیهانی ئافاقیدا، هەم لە جیهانی دڵیدا و هەم لە بەردەم بەدیهێنەری خۆیدا، بەتەواوەتی دەستی لە نەفسی خۆی و بەرژەوەندییە کەسییەکانی و ئەندێشە و نیگەرانییەکانی داهاتوو، هەڵگرتووە. ئەو خەمخۆرێکی خاوەن دڵی پێغەمبەر ئاسایە، زۆرجار سەرەڕای پەرێشانیی لاشە و جیسمانییەتی، نەخشە بۆ بەختەوەریی ئەوانەی چواردەوری دادەڕێژێت و

---

١. الغزالي، إحياء علوم الدين ١٥/٢، ٢١٢/٥.

پڕۆژەی ڕەنگینی بەختیاری و ئارامی بۆ ئەو کۆمەڵگەیە پەرەپێدەدات کە تێیدا دەژی و لە بەرامبەر ئازار و مەینەتییەکانی مرۆڤایەتی بەگشتی و نەتەوەکەی بەتایبەتی، مۆتەکە دایدەگرێت.

لەم ڕووەوە ئەو پاڵەوانێکی خەباتکاری وایە کە لە بواری دەرگیربوون لەگەڵ ئەو خراپانەدا کە چواردەوری هەموو دنیا بەگشتی و مرۆڤی ئێمەی بەتایبەتی تەنیوە و لە بەرپەرچدانەوە و جەنگان لە دژیاندا، بەدەم کێشانی نەخشەی ئەو شتانەی پێویستە بیکات ژان لەسەر ژان دەیگرێت، بەڵام خۆی بەدووردەگرێت لەوەی ڕێی لە کۆڵانی دەرنەچووی "ڕوونکردنەوە و وێناکردنی ناحەق، زیهنە خاوێنەکان دەشێوێنێت."[١] بکەوێت و بەدەم هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنی کاولکارییەکانەوە هەنسك دەدات و هاوڕێ لەگەڵ نەوینێکی جددیی بۆ فەرمانبەرییەکان و هەڵپەی بەرپرسیارێتی و شعووری ئیحسان، هەمیشە هەڵدەکوتێتە سەر کێشەکان. پاڵەوانێکی خەباتکاری وا کە بە هەژاری و لاوازی باڵی گرتووە و شەوق و سوپاسگوزاری دەیخەنە گەڕ و لەژێر بەرپرسیارێتی ئاسایشی گشتی و زیندووکردنەوەی حەقیقەتدا دەناڵێنێت. ئەمە بەرپرسیارێتییەکی وایە کە هیچ بابەتێك -بەمەرجێك لە چوارچێوەی تێگەیشتن و ئیرادەی مرۆڤدا بێت- ناکەوێتە دەرەوەی سنوورەکەی. بەرپرسیارێتی لە بەرامبەر بوون و ڕووداوەکاندا.. بەرپرسیارێتی لە بەرامبەر کۆمەڵگا و ژینگەدا.. بەرپرسیارێتی بەرامبەر ڕابردوو و داهاتوو، زیندوو و مردوو، گەنج و پیر، خوێندەوار و نەخوێندەوار، ئاسایش و ئاشتی.. وە بێگومان ئەو حاڵەتەی کە هەموو ئەم لێپرسراوێتییانە لە شێوەی ئازاردا لە سینەدا هەستیان پێبکرێت

١. بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی، مەکتووبات.

و لە ڕۆحیشدا بە وێنەی مۆتەکە خۆیان نمایان بکەن، لە پێشبڕکێی گرتنی پلەی یەکەمدان. پێم وایە ئەو شتەی بەهایەکی بێسنوور دەدات بە مرۆڤ و لە خوا نزیکی دەکاتەوە هەمان ئەم خەباتە پێغەمبەر ئاسایە و ئەم میعراجی ڕۆحەیە کە سەرمان دەخات بۆ ئەو خەباتە!

بەڵێ، ئازار و ژانێك کە لە هەستی بەرپرسیارێتییەوە سەرچاوەی گرتبێت، بەتایبەت ئەگەر بەردەوام بێت، دوعایەکی وەرگیراو و کانیاوێکی بەهێزی بەرهەم هێنانی پرۆژەی یەدەك و کاریگەرترین ئاوازە لەسەر ئەو ویژدانانەی کە توانیویانە بە خاوێنی بمێننەوە. هەر مرۆڤێکی خاوەن ڕۆحی مەزن، دەتوانێت بە ئەندازەی فراوانیی ژان و ئازارەکەی، سنووری هێزی خۆی و تەنانەت هێزی کۆمەڵەکەشی ببەزێنێت و ببێت بە چەقی کۆبوونەوەی هێز و توانای نەوەکانی ڕابردوو و داهاتوو. لێرەدا جارێکی تریش ئەوە یاد دەخەینەوە کە پێویستە ئەوانەی دەژین لەوانە جیابکەینەوە کە دەژیێنن. ئەوەی کە ئێمە هەمیشە بە جەختەوە هەڵوێستەی لەسەر دەکەین، ئەو میراتگرە ڕاستەقینانەی حەقیقەتە مێژووییەکانن کە، بەجۆرێك دڵسۆز و وەفادار و خەمخۆری کەسانی ترن خۆیان لەبیردەچێتەوە و هێندەش سپاردەپارێزن کە دەتوانین ڕۆحی خۆمانیان بە ئەمانەت پێ بسپێرین. ئەوان هەرگیز نایانەوێت خەڵکان شوێنیان بکەون.. بەڵام بوونی ئەوان بانگەوازێکی هێندە بەهێزە کە بەری لێ ناگیرێت و لە هەر جێگایەکدا بن، وەك هێزێکی کەمەندکێش، خەڵکان بەرەو ڕووی ئەم ڕەببانییانە ڕادەکەن.. تەنانەت ئامادەن لەبەر خاتری ئەوان بە پێکەنینەوە پێشوازی لە مەرگ بکەن.

ئاینده، بەرهەمی ئەو ڕەببانییانە دەبێت کە نوێنەرایەتیی ئەم

لێپرسراوێتی و ئەم کارمەندییە گرنگە دەکەن. بوون و مانەوەی نەتەوەکەمان و ئەو نەتەوانەی تریش کە پەیوەندییان بە نەتەوەکەمانەوە هەیە و سەرجەم واریداتەکانی شارستانێتییەکی تازە و نوێ و دینەمۆ ژیانبەخشەکانی کلتوورێکی دەوڵەمەند، لە ڕێگەی هەناسەکانی ئەوانەوە هەناسەیەك دەدات و لەسەر شانی ئەوان ئاڵا هەڵدەکات و هەر لەسەر شانە بەهێزەکانی ئەوانیش دەگوازرێتەوە بۆ ڕۆژانی داهاتوو. چونکە ئەوان ئەمانەتپارێزی حەقیقەتە مەزنەکان و میراتگری دەوڵەمەندییە مێژووییەکانمانن.

بوون بە "میراتگری مێژوو" مانای ئەوەیە کە خەرمانی ورد و درشت و زانراو و نەزانراوی ڕابردوو هەڵبسەنگێنرێت و بەخێو و گەورە بکرێت و پێکهاتەی نوێیان لێ دروست بکرێت و پاشان بگوازرێتەوە بۆ ئەو نەوانەی داهاتوو کە خاوەنی ڕاستەقینەی ئەم شمەکەن. ئەو، ئەگەر ئەم ئەرکە مێژووییە گرنگەی پەیوەستە بەمڕۆ و بە سبەی جێبەجێ نەکات، کەواتە ئەمڕۆی دۆڕاندووە و بەیانیشی بە زایە داوە. ئەمە بەرپرسیارێتییەکی وایە کە ئەگەر میراتگر غەفڵەت یان تەمبەڵی سەری تێبکات، یان بەدوای کەسێکی تردا بگەڕێت تا ئەم کارە حەواڵە بکات، تەنانەت ئەگەر دڵیش بدات بە جوانییە سەرنجڕاکێشەکانی ئەودنیا و ئارەزوویان بکات، بە ئەندازەی هەر یەکێك لەمانە خیانەت لە پەیام و بانگەوازەکە دەکات و لە ئەنجامیشدا پردەکانی نێوان ئێمە و داهاتوو دەڕووخێنێت. لە حاڵێکدا سەبارەت بە بوون و مانەوەمان، پێویستە بە چاوێك بۆ داهاتوو بڕوانین کە بە حەتمی هی ئێمەیە. کردنی ئەمە بە ناونیشانی هەستەکانمان و بیرکردنەوەکانمان و نەخشەکانمان، سەبارەت

بە چالاکیی جموجوڵەکانمان یەکجار گرنگە. پێچەوانەی ئەمە، بێڕێزی و خیانەتە لە ئوممەتەکەمان. کاتی ئەوە هاتووە کە لە بابەتەکانی وەك دین و زانست و هونەر و ئەخلاق و ئابووری و خێزان و هەموو بوارەکانی تردا، شان بدەینە ژێر ئەو دامەزراوانەی کە خۆمانەن و بیانگەیەنینەوە بەو ئاستە ڕاستەقینەیەی لە مێژوودا هەیانبووە، تەنانەت خەریکە کات بەسەردەچێت و درەنگ دەکەوێت. ئێمە ئەمڕۆ وەکو ئوممەت، بەدوای مرۆڤگەلێکی خاوەن ئیرادە و گوڕ و خەباتدا وێڵین تا ئەم بەرپرسیارێتییە بخەینە سەر شانیان.

ئێمە پێویستمان بە هاتنی خێر و بەرەکەتی دەرەکی و ناوەکی و هاوردەکردنی سیستەمی فیکری نییە، بەڵکو ئاتاجی کۆمەڵێك پزیشکی ڕۆح و هزرین کە هەستی لێپرسراوێتی و ڕەنج و ژان کێشان لە سەرتاپای ئەندامانی میللەتەکەماندا بێداربکەنەوە. پزیشکگەلێکی ڕۆح و هزری وا کە لەبری بەختەوەرییە کاتییەکان قووڵی و فراوانی دەبەخشن بە ڕۆحمان و بەرزمان دەکەنەوە بۆ ئاستێك کە لە یەك کاتدا سەرەتا و کۆتا پێکەوە ببینین.

بەڵێ، ئێمە لە ئێستادا چاوەڕێی کەسانێکی واین ئەگەر پێویستی کرد واز لە بەهەشتیش بهێنن، هێندە عاشقی بانگەواز و لێپرسراوێتی بن تەنانەت ئەگەر چووبنە ناویشییەوە بەدوای ڕێگاکانی چوونەدەرەوەدا بگەڕێن. "ئەگەر خۆر بخەنە سەر شانێکم و مانگیش بخەنە سەر شانەکەی ترم، من واز لەم کارە ناهێنم!"[١] ئەمە ئاسۆی پێغەمبەرە (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ).. یان بە هاواری "خوایە جەستەم هێندە گەورە بکە

---

١. إبن هشام، السيرة النبوية ٢/١٠١؛ الطبري، تأريخ الأمم والملوك ١/٥٢٥.

هەموو دۆزەخ بگرێتەوە و جێی کەسی تری تێدا نەبێتەوە!"[١] ئاسمانەکان دەهێنێتە لەرزە. دەماغێکیش کە بە نوورەکانی ئەم ئاسۆیە حاڵ گرتوویەتی، دەڵێت "لە دڵمدا نە خۆشەویستیی بەهەشت و نە ترسی دۆزەخ هەیە، ئەگەر ئیمانی میللەتەکەم سەلامەت بێت، ڕازیم بە سووتان لەناو گڕ و بڵێسەی دۆزەخدا!"[٢]

بەڵێ، هەنووکە مرۆڤی ئێمە لە هەموو شتێکی تر زیاتر پێویستی بە کۆمەڵێکی دڵ فراوانی وایە کە بۆ گوناهەکانی میللەتەکەی بگری و لێخۆشبوون و بەخشرانی مرۆڤایەتی لە پێش بەخشرانی خۆیەوە دەبینێت و لە ئەعرافدا وەستاون و تامی خۆشیی بەهەشتییەکان دەکەن، ئەگەر بچنە بەهەشتیشەوە کاتی سەرگەرم بوونیان نابێت بە چێژە شەخسییەکانەوە...

١. حەزرەتی ئەبو بەکر.

٢. بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی، مێژووی ژیان.

## هەستی بەرپرسیارێتی

گرنگترین سیفەتی هەبوون جووڵە و بزاوتنە. مەنگی و وەستان ناوێکی ترە بۆ مردن و لەناوچوون. سازکردنی پەیوەندی لەنێوان جووڵە و لێپرسراوێتیشدا، یەکەم ڕەهەندیی مرۆیی بزاوتنە. جووڵە و بزاوتنێك کە بە یاسا و ڕێسا ڕێکنەخراوە، هەرگیز ناکرێت بە پڕ و تەواو وەسف بکرێت.

زۆربەی مرۆڤەکان شوێن چەند مەبەست و ئامانجێك دەکەون و بەدویدا ڕادەکەن، بەڵام تا ئەو هەوڵ و تێکۆشانە تێکەڵ بە لێپرسراوێتی نەبێت، چاوەڕوانکردنی شتێکی باش لێیان کارێکی بێهودەیە. ئەگەر ئەو بەرژەوەندی پەرستانەی کە هەڵپە بەری چاوی گرتوون بێ ماندووبوون و پشوو هەوڵبدەن و، سیاسییەکان بگەڕێن و وتەی ڕازاوە و بریقەدار هەڵبرێژن و، لە ڕێگەی دەزگاکانی ڕاگەیاندن و بەرنامەکانی هەواڵ و شرۆڤەوە خۆیان دەربخەن و، کۆمەڵێکیش بەدرێژایی ساڵ هەوای بەدڕەوشتی هەڵبمژن و، هەندێکیش لە بەرگ و پۆشاکی پیاوانی ئاییندا هەردەم بەدوای مافی چێژوەرگرتن و خۆشگوزەرانیدا لرفەیان

بێت و، دانیشتووانی ناوبازاڕ بەدەم خەیاڵی هەڵبەز و دابەزی بۆرسەوە ڕۆژ و شەو بکەنەوە و، لە هەندێك لە فەرمانگەکانی دەوڵەتدا پارە بڕژێت بەسەر ئایدۆلۆژیا جۆراوجۆرەکاندا و، بەشێك لەوانەش کە ئاوەزیان بە شت دەشکێت بێباکانە تەماشای هەموو ئەم کارەساتانە بکەن، واتە ئەگەر ستەمکار ستەم بکات و ستەملێکراویش دەستوورەکانی "هەڵبژاردنی سروشتی" یان "مانەوە بۆ بەهێزترینە" قبووڵ بکات، مانای وایە ئەو شتانەی پێویستە بکرێن، ئەنجامدانیان زۆر گران و سەخت بووە. بەجۆرێك ئەگەر لە قارەمانی ئەم جووڵە و پێکهاتنە شوومانە، یان لەوانەی کە لەنێوان چنگ و ددانە تیژەکانی ئەم کارەساتانەدا ئەنجن ئەنجن بوون، بپرسیت ”ئەوە بۆ کوێ دەڕۆن؟“، لە بەرامبەردا ئەگەر زللەیەکتان تێنەسرەوێنن یان تف لە ڕووتان نەکەن، بێگومان وتەیەکی ناخۆش دەدەن بە ڕووتاندا و پێتان پێدەکەنن. لەوانەشە پێتان بڵێن ”هەرکەسە و دەچێتە قەبری خۆی.“ یان زیاتر پێی لێ ڕابکێشن و بێباکانە بڵێن ”ئاگرە سوورە لە خۆم دوورە.“ تەنانەت لەوانەیە شێتی وا هەبێت وڕێنە بکات و بڵێت ”مارێك بە منەوە نەدات، خوای دەکرد هەزار ساڵ دەژیا!“ هەموو ئەمانەش لە ویژدانە هۆشیارەکاندا کاریگەریی مۆتەکە بەرهەم دەهێنێت. مەگەر خوا بۆ خۆی بزانێت لەم دۆڵەدا چەند وتە و کرداری نەشیاوی تر هەن کە دێن و بەر بیری پاك و هەستی بێگەردتان دەکەون...

ئەوەندە هەیە هیچ یەکێك لەمانە بیرکردنەوەی دڵە باوەڕدار و هەستیارەکان نین. هەرچەندە تەنها وتنی ئەوەی کە ئەمانە کۆمەڵێك وتەی نەشیاو و وڕێنەئاسان، لەگەڵ هەستی بەرپرسیارێتی ئێوەدا یەك ناگرێتەوە. چونکە وەکو ئوممەت، چواردەورمان بە دوژمن و دوژمنایەتی

تەنراوە. هەتا ئەم ئابلۆوقەیەشمان لەسەر بێت، ناتوانین لە هەست و بیر و باوەڕ و هونەر و کاروباری شەخسیدا ببین بە خۆمان و ناتوانین شەرەفی ئیسلامی و ناموسی میللیمان بپارێزین و ناتوانین کەشتییەکەمان ڕزگاربکەین و بیگەیەنین بە کەناری ئارامی، ناتوانین دنیای خۆمان بنیات بنێین و بەدڵی خۆمان بژین، ناتوانین ببین بە میراتگری زەوی و ناتوانین بگەین بە خوا.. بەڵێ، ئیتر پێویستە چاومان بکەینەوە و ڕاستی ببینین، بەسیرەتمان بخەینە کار و خۆمان بکەین بە خاوەنی ئەو شتانەی لە دوێنێ و ئەمڕۆدا هی ئێمە بوون و، هەموو ئەو شتانە فڕێ بدەین کە لە ناوەوە بوون و شەخسییەتمان کرمۆڵ دەکەن. ئەگینا ڕۆژێك دێت پاراستنی ئەو شتانەش کە هەنووکە خاوەنیانین، مەحاڵ و سەخت دەبێت.

سەردەمانێك دوژمنەکانی ئێمە نەزانی و هەژاری و دەمارگیری و دووبەرەکی بوو. ئەمێستا فێڵبازی و بەدڕەوشتی و بێباکی و خۆسەپاندن و ئارەزووپەرستی و لەدەستدانی ناسنامەشی چووە سەر. با ئەوانەی پاکیی ئایین و بێگەردیی فیکر و هەیەجانی میللیی خۆیان پاراستووە و ئەوانەش کە لە بەرامبەر ئەم ڕووداوانەوە ترس و ئەندێشە دایگرتوون بمبوورن، بەڵام وا ماوەیەکی دووردوورودرێژە کە نەوەی لاو و هەندێك لە پیرە ساویلکەکان لە ڕێگەی حەماسەتە بۆشەکانەوە لەڕێ دەترازێنرێن و لەلایەن ئەو ئایدۆلۆژیایانەوە کە جگە لە قسەی زرق و برق هیچی تریان تێدا نییە لەخشتە دەبرێن و لە ئەنجامی ئەوەدا کە خەڵەتێنەر نین و خەڵەتێنراون، ژیانێکی پڕ لە ئازار و ژان بەسەر دەبەن. ئەم لادانی فیکر و ئەم لەدەستدانی کەسایەتییە، ئەگەرچی لەناو کۆمەڵێکی میللەتیشدا ڕوویدات، وەکو سەرلەنوێ داگیرکردنەوەی ئەم نیشتمانە وایە. وەك ئەوە

وایە "فاتیح" ژەهرخوارد کرابێت و "موڕاد" خەنجەری لێ درابێت و "یلّدرم" لە داخدا مردبێت و "یاوز"یش دووچاری شێرپەنجە بووبێت.[1] ئەمەش ڕوون و ئاشکرا بریتییە لە کوشتنی ئەو ڕۆحی ئوممەتەیی کە لە مەیدانی خەباتی سەربەخۆیی بە سەرکەوتوویی هاتە دەر، بە دەستی ڕەشی گوناهەکانی سەردەم و غەفڵەتی ڕووناکبیران و بێباکیی حەشاماتەکان.

ئێمە لەژێر بەرپرسیارێتی بەخشینی ڕۆحێکی تەواو نوێداین بە دنیاکەمان کە لە ئیمان و خۆشەویستی بۆ مرۆڤ و بۆ ئازادی چنراوە و سازاندنی زەمینە بۆ داکوتینی ڕەگە مەعنەوییەکانی درەختێکی پیرۆز کە لەسەر هەمان ئەم بنەمایانە نەش و نمای کردووە. بێگومان مافدان بەم لێپرسراوێتییە وابەستەی بوونی ئەو قارەمانانەیە کە خۆیان دەکەن بە خاوەنی چارەنووسی نیشتمان و مرۆڤەکانی ناوی و مێژووەکەی و دین و عادەت و دابونەریت و هەموو پیرۆزییەکانی.. پابەندی بوونی ئەو پاڵەوانانەیە کە لێوانلێون لە عەشقی زانست و ئاوەدانکردنەوە و بنیاتنان و، دینداری‌ێکی دڵسۆز و نیشتمانپەروەرن و، هاودەم لەگەڵ هەستی لێپرسراوێتیدا هەمیشە لەسەر کار و فەرمانبەرییەکانیانن. لە سایەی ئەوان و هەوڵ و کۆششەکانی ئەواندا بیرکردنەوە و تێگەیشتنی خۆمان و بەرهەمەکانی ئەم شتانە فەرمانڕەوای ژیانمان دەبن.. لە هەمووانیدا هەستی تەرخانکردنی نەفس لەپێناو خزمەتی کۆمەڵگادا بەهێز دەبێت.. بیری دابەش کردنی کار و هاوکاری کردنی یەکتری دیسان سەوز

---

١. ئاماژەی ئاسکی تێدایە بۆ ڕووداوە مێژووییەکانی وەك: ژەهرخواردکردن و شەهیدبوونی فاتیح، کوژرانی سوڵتان موراد بە خەنجەری صربییەك دوای ئەوەی داوای ئەمانی کرد و دالّدە درا، دیلێتیی سوڵتان بایەزیدی یلدرم لای تەیموری لەنگ، مردنی سوڵتان یاووز بە شێرپەنجە.

دەبێتەوە.. خاوەن کار-کرێکار، ئاغا-گوندنشین، فەرمانبەر-مرۆڤی سەر شەقام، خاوەنماڵ-کرێچی، هونەرمەند-هونەردۆست، خاوەن-بریکار، مامۆستا-قوتابی، وەك ئەوەی رووی جیاوازی یەك شت بن، سەرلەنوێ دێنەوە مەیدان و ئەو شتانەی کە چەندین سەدەیە چاوەڕوانیان دەکەین یەك بە یەك دێنەدی. ئەمێستا لە دەمێکدا دەژین کە خەونەکانمان دەکەین بە ئامانجی باڵا. باوەڕمان وایە ئەگەر کاتی خۆیشی هات، هەموویان دەبن بە ڕاستی.

بەڵێ، خەون و خولیای چەندین سەدەی ڕەبەقی ئێمە ئەمەیە، یەکەم ڕێگای هێنانەدی ئەم خەون و خولیایەش هەستی بەرپرسیارێتی و ئەخلاقی بەرپرسیارانەیە. مادەم وەستانی تەواوەتی مردن و داڕمانە و نابەرپرسیاریش لە جموجوڵدا هەرەمەکێتی و ئاژاوەی لێ دەکەوێتەوە، کەواتە هیچ بژاردەیەکی ترمان نییە جگە لە ڕێکخستنی ڕەفتارەکانمان بەگوێرەی یاسا و ڕێساکانی لێپرساوێتی.. بەڵێ، پێویستە ئێمە هەموو کردارێکمان خولگەکەی بەرپرسیارێتی بێت. ڕێگامان ڕێگای حەق و پەیامی مان "بەرزکردنەوەی حەق" و ئامانجیشمان لە هەستان و دانیشتنماندا "گەڕانە بەدوای ڕەزامەندیی خوادا". لەڕاستیدا بوونی ئەمە بەم شێوەیە، سەدەقەی مرۆڤێتیمانە و هۆکاری بەدیهاتنی ئیرادەمانە. خۆمان بە ناچار دەزانین لەوەدا کە لە ژیانماندا بەدوای ئامانجی ژیاندا بگەڕێین و، ڕۆحمان بگەیەنین بە عەشق و، ویژدانمان بکەین بە خاوەنی هەستی بەرپرسیارێتی و، ڕێگاکانی زانست و هونەر و ئەخلاق و حیکمەت پیشانی ئەوانە بدەین کە چاویان بە سەرچاوەی سیستەمێکدا کراوەتەوە کە بناغە و نوور و هێزەکەی ئیمان و ئەوینە. بەڵێ، ئێمە خۆمان بۆ ئەم

ئەرکە پیرۆزە تەرخان کردووە. ئومێدەوارین هەوڵ و کۆششەکانمان لەسەر هەمان هێڵی ئەو ئەولیا و ئەصفیا و پیاوچاکانە بێت کە لە سەرەتای مێژوومانەوە تا ئەمڕۆ درێژبووەتەوە و لەسەر ڕۆحانییەتی ئەوان گەشە و نەشونما بکات. ئەمەش دەبێت بە سەرەتای جووڵەی ڕێنیسانسی ئێمە.

هەتا ئێستا هەموو سەردەمێك کەرامەتێکی تایبەت بە خۆی هەبووە. ئەوەتا مرۆڤایەتی لە سەدەی شەشەمی زاینیدا دیسان زیندووبوویەوە[1]. وا هەست دەکەم کەرامەتی سەدەی بیست و یەکەم لە شێوەی گەڕانەوەی میللەتانی موسڵمان دەبێت بۆ ناو هاوکێشەکانی هاوسەنگیی جیهانی. ئەم پێکهاتە نوێیەی کە ئاڕاستەی مێژووی دنیا دەگۆڕێت، خولگەکەی ڕۆح و ئەخلاق و عەشق و فەزیلەت دەبێت. بەڵێ، لەم جیهادە مەعنەوییەماندا کە دەکرێت ناوی زانست و ڕەوشت و حەق و عەدالەتیشی لێ بنرێت، باوەڕمان وایە کە پارچە لەیەکدابڕاوەکانی ئوممەتە پیرۆزەکەمان -کە لە شوێنە جۆراوجۆرەکانی دنیادا چەندین ساڵی دوورودرێژە پەرێشان و دەربەدەرن- کۆدەکاتەوە، ئەو ئەوانەش کە هەتا ئەمڕۆ بێ ئامانج و بێ خاوەن بوون، لە دەوری مەبەستێکی باڵا خڕدەکاتەوە و وەك ئەوەی گەیشتبن بە "ئاڵای سوپاسگوزاری" (لواء الحمد)، تامی زیندووبوونەوەیەکی نوێ دەکەن.

---

١. مەبەست لێی لەدایکبوونی حەزرەتی محەممەدە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).

## لە پشێوی و ئاژاوەوە بەرەو ڕێسا

ماوەی چەند سەدەیەکە کۆمەڵگاکانی ئێمە لە بوارەکانی ئەخلاق و فەزیلەت و بیری زانستیدا بە وێنەی وێرانەیەك داری بەسەر بەردیەوە نەماوە. بەڵێ، ئەو لە پەروەردە و هونەر و ئەخلاقدا بەدوای بیر و ڕێسایەکی جێگرەوەدا دەگەڕێت. ڕاستتر بڵێین لەم هەرێمە پان و بەرینەدا، لەبری ئەو ڕۆحە هەتیو و بیرە ناشرینانەی کە گرنگی نادەن بە هەستی بەرپرسیارێتی و بەها مرۆییەکان و زانست و ئەخلاق و بیرکردنەوەی ڕاستەقینە و فەزیلەت و هونەر، پێویستی بە کۆمەڵێك ئیرادەی پۆڵایین و مێشکی زیرەك هەیە کە بوون بە هەموو قووڵاییەکانی و مرۆڤیش بە سەرجەم فراوانییەکانی دنیا و دوارۆژیەوە لەباوەش بگرن و سەرلەنوێ ڕاڤەیان بکەنەوە و تەنانەت بە ناونیشانی جێنشینی خوا لەسەر زەوی دەست لە کاروباری بوونەوەران و ڕووداوەکانی ناویان وەربدەن.

دواین گۆڕانکاری و پێشهاتەکانی دنیا، هەروەك دەمامکی سەر ڕوخساری زۆرێکی لادا و ڕووی ڕاستەقینەیانی دەرخست، بەهەمان جۆر و تا ئەندازەیەك پەردەی لەسەر چاوەکانی ئێمەش لادا.. لە ئەنجامدا سەبارەت بە ئێمە، ماهییەتی ڕاستەقینەی هەموو شتێك و هەموو کەسێك

زیاتر ڕوون بووەوە. هەنووکە پێشهاتەکان ڕوونتر دەبینین و ئەنجامی پتەوتر لە ڕووداوەکان هەڵدەهێنجێنین. ئەمێستا تێدەگەین وا ماوەی دوو سەد ساڵی ڕەبەقە کە لەم نیشتمانە فراوانەدا، ئەوە تەنها جلوبەرگ و بیرکردنەوە و فەلسەفەی ژیانمان نەبووە کە دووچاری فرێدان و بێڕێزی و چارەڕەشیی لەبیربردنەوە بووە، بەڵکو کلتووری میللی و شعووری مێژوویی و سیستەمی ئەخلاقی و بیری هونەری و ڕەگ و ڕیشەکانی مەعناشمان بە ئەندازەی ئەمانە، تەنانەت زۆر لەوان زیاتریش دووچاری کاولکاریی مەزن بوونەتەوە و پەیوەندییە ڕۆحییەکانمان بەجارێك لەرزیوە و سەرچاوەکانی چاکەکاریمان وشکی کردووە و کەندەڵانی وا کەوتووەتە نێوان ئێمە و ڕابردوومەوە کە تێپەڕاندنی گەلێك سەختە.

بەڵێ، لەم دنیا مویارەکەدا کاتی وا هەبووە ڕۆشنبیرەکان تیایدا بێدەنگ بوون و زنجیر لە دەمی هزر دراوە و ئەوانەش کە نوێنەرایەتیی هێز و دەسەڵاتیان کردووە، پشتی گومڕایی و دەستبەرداربوون لە باپیرانیان گرتووە و نەوە داماوەکانیش بەدەم ورێنەی سەرسووڕمانەوە، بێگیان و بێهیوا کەوتوون و لە باوەشی هەستە تاریکەکاندا حەشر و نەشر بوون.

لەم سەردەمە پڕ لە نەهامەتییەدا کە گشت لایەکی بە نائومێدی تەنراوە، زۆرجار چاوان لە ڕێگەی فرمێسکەوە هەناسەیەکی ئاسوودەییان هەڵمژیوە و دڵانیش بە یارمەتیی خۆدواندن هاواریان بە ڕووی ئەو ڕووخسارانەدا کردووە کە شەرم ناناسن و لەم ڕێیەوە خەمی خۆیان هەڵڕشتووە. هەروەها بەدەم وتنی "دەتوانرێت چی تر چاوەڕێ بکرێت لەم سەرسامانەی چارۆکەیان بە ئاڕاستەی ئیلحاددا هەڵداوە، لەم نەزانانەی چەپڵە بۆ هەموو کەس و هەموو شتێك لێدەدەن، لەم بێویژدانانەی

ڕاهاتوون سەر بۆ هێز نەوی بکەن، لەم شەرەف و نامووسە لەکەداربووانە؟“
وە ناڵاندوویانە. بەڵام ئەوەی لەرزیوە، ڕووخاوە و ئەوەی ڕۆیشتووە، بەسەرچووە و لە شوێنەکەشیدا شتێکی نوێ بنیات نەنراوە..

بەڵێ، هەر هەموومان، تەنانەت بەو ڕیالیستانەشەوە(!) کە جگە لە سەرگەرمی و خۆشگوزەرانی بیر لە چیی تر ناکەنەوە و بە شایەتیی ئەو نائارامی و دڵتەنگییەی کە بەتایبەتی لە ئێستادا لە قووڵایی دڵماندا هەستی پێدەکەین، ئەوەی لەرزیوە هەپروون بە هەپروون بووە و لە جێگاکەشیدا هیچ شتێکی تر بەرز نەکراوەتەوە و کۆمەڵگا لەسەر ئاستی بەهاکان دووچاری سەرەوژێربوونێکی تەواوەتی بووەتەوە.

ئێستا تکاتان لێ دەکەم، ئەو هەژارییەی بواری ئەخلاق کە ژیانی کردووە بە بارێکی سەخت و مەتەڵێکی داخراو و ئەو قەیرانانەش کە ڕۆژانە شێوەی گەرداوی ترسناکتر لەخۆدەگرن، ئایا دەتوانین بە چ شتێك ڕووبەڕوویان ببینەوە؟. چۆن لە کێشە کەسی و خێزانی و کۆمەڵایەتییەکان ڕزگارمان دەبێت؟. وە چۆن دەتوانین بە ئاسوودەیی هەنگاو بۆ دواڕۆژ هەڵبێنین؟ بە سێ چوار فەنتازیا کە لێرە و لەوێی دنیا هاوردەمان کردوون؟ یان بە عەقڵگەرایی سەردەم کە دەمانەوێت هەموو شتێکی لەسەر بنیات بنێین؟.. نەخێر نەخێر! نە ئەم بیرە زۆڵ و نە ئەو لۆجیکە تاریکەش توانای ئەوەیان نییە بچنە ژێر ئەم بارەی کە لە کێوی قاف قورسترە.

بەدرێژایی چەندەها ساڵ لەم جوگرافیایەدا، هەر هەڵمەتێکی نوێبوونەوە درابێت، تەنها لەسەر ئاستی گۆڕانکاریی ڕووکەشیدا ماوەتەوە، نەتوانراوە

هەوڵەکان ئاڕاستەی ئامانجێکی باڵا بکرێن و نە توانیومانە بگەین بە بچووکترینی ئەو مەبەستانەی دیاریکرابوون. ئەوانەی لوتکەکانیان داگیرکردبوو، وەك ئەوەی فڵچەیەکی زبر و تیژیان بەدەستەوە بێت، هێنانی ئەم فڵچەیەیان بە زامە میللی و کۆمەڵایەتییەکاندا بە هونەر، بەڵکو بە شۆرش زانیوە و هەرگیز نەیانتوانیوە ئەو خوێن بەربوونە ناوەکییانە ببینن کە گرنگترین ئەندام و ئۆرگانەکانی کۆمەڵگای گرتبووەوە. جگە لە مەزهەرییەت و نوێنەرایەتیی دەگمەنی قارەمانانی سەربەستیی لە مێژووی نزیکماندا کە هێزیان لە ئیمان و ئومێد و خەبات وەرگرتبوو، ئەمە هەر بەم شێوەیە هاتووە. جگە لەوەش هەرگیز لە تواناداا نییە بڵێین کە توانیومانە درێژە بە هێز و گوڕ و خاوێنیی ئەو تەوژمە پیرۆزە بدەین. بەڵێ، هەنووکە باسکردنی هەستان و زیندووبوونەوەیەکی لەو شێوەیە و یەکێتی و یەکڕیزییەکی لەو جۆرە ئەگەر مەحاڵیش نەبێت، تابڵێی گرانە..

لەم ساڵانەی دواییدا حەشاماتەکان و چینە کۆمەڵایەتییەکان لە یەکتر دابڕان و بۆشایی کەوتە نێوانیان، بەجۆرێك ئەگەر لە ڕووی ژیانی بیر و ڕۆحەوە جیاوازییەکی وا جددیشیان نەبێت، کەچی بە یەکجاری نامۆ بوون بە یەکتری و وەك بڵێی بوون بە گورگ بۆ یەکدی. بە ئەندازەیەك ئەمیان بڵێت ڕەش، ئەوی تر دەڵێت سپی.. یەکێکیان بۆچوونێك پێشنیار بکات، ئەوی دی دژایەتی دەکات.. ئەمیان پێشنیاری بەدیلی ئەوی تر بە گێرەشێوێنی وەسف دەکات.. ئەمیان دامەزراوی ئەوی تریان بە دەمارگیری دەزانێت.. جا ئەگەر سەرەڕای ئەم هەموو نەهامەتییانە، بۆ دەستنیشانکردنی ئەو لایەی لە بابەتێکی دیاریکراودا لەسەر حەقە،

کۆمەڵێك پێوەر نەبن کە لەلایەن هەمووانەوە قبووڵکراوبن، ئیدی بۆ خۆتان تەسەووری سنوورەکانی ئەم پێکدادانە، ڕاستر بڵێین ئەم شەڕە کوێرانەیە، بکەن!.

لەم ڕووەوەیە کە ئێمە لەمڕۆدا و لە هەموو شتێکی تر زیاتر پێویستمان بە ڕێگایەکە بمانگەیەنێت بە حەقیقەت و فەزیلەت و شێوازێکی بیرکردنەوەی فریونەدەر و بە کۆمەڵێك پێوەری سەرنەکەر. لەڕاستیدا، هەریەك لە ویژدان و پێوەرە ئەخلاقییەکان دەکرێت بە سەرچاوەی ڕووناك ئەژمار بکرێن سەبارەت بە چارەسەرکردنی زۆرێك لە کێشەکان، بەڵام بەداخەوە ئەمڕۆ ئەو ویژدانە بریندار و بەها ئەخلاقییەکانیش تارومارن. بەڵێ، ئەم دوو دینەمۆ گرنگە لە ڕەگەوە ڕیشەکێشکراون و وەك دوو کۆنە کانیی وشکبوو وان..

بەرزی نادات بە ئەخلاق، نە عیرفان و نە ویژدان

ترسی خوایە مەنبەعی هەستی فەزیلەتی ئینسان

ئەگەر خوا نەکا، دەرچێت لە دڵان ترسی یەزدان

تەئسیری نامێنێت قەتعەن، نە عیرفان و نە ویژدان[1]

جا ئەگەر ئەمە لاوازیی ئیرادەکان و بێسەروبەرەیی داوەرییەکانی ژیری و دڕندەیی و خوێنخۆریی هەستە مرۆییەکانیشی بچێتە سەر، بە ئاسانی فراوانی و قووڵیی ئەو کابووسە دەردەکەوێت کە تێیدا دەژین...

لەم ڕووەوە پێویستە سەرەتا چاو بە کۆڵەکە بنەڕەتییەکانی داوەریی ژیریماندا بخشێنینەوە و جارێکی تر هێڵی بیری لۆجیکی بدۆزینەوە

١. محەممەد عاکیف.

و مافی تەواو بە ئیرادەمان بدەین و ئەوەی هەڵمەتبەر و خەباتکار پێبگەیەنین. پێش لە هەر شت مادەم لە جیهانێکدا دەژین کە بە هۆکارەکان تەنراوە، هەرگیز ناکرێت چاو لە ئاستیاندا بنووقێنین. گرنگی نەدان بە هۆکارەکان لە دنیای هۆکارەکاندا، بێ چەند و چۆن جەبرییەتە و کەواتە گومڕاییە. نەك هەر ئەمە، بەڵکو ڕەچاوکردنی پەیوەندیی نێوان هۆکار و ئەنجام یەکێکە لە گرنگترین داخوازییەکانی تەکلیف و بەرپرسیارێتی.

لێرەوە ئەگەر ئەمڕۆ هاودەم لەگەڵ هەستێکی جددی لێپرسراوێتیدا، بناغەکانی ئەو بیرە زیانبەخش و ئەو تەوژمە کاولکارانە دەستنیشان نەکەین، مانای وایە هەمان ئەو قەیرانە کۆمەڵایەتی و ئەو دارمانە ئەخلاقی و ئەو لادانە ڕووخێنەرانەی کە ئەمڕۆ بە دەستیانەوە دەناڵێنین، لە داهاتووشدا لەسەر ئاست و ڕەهەندی جیاواز دیسان یەخەمان دەگرنەوە. هەست کردن بە کاولکاری و مایەپووچی لە دوای ڕوودانی کارەساتەکان، مەعریفەت نییە. بەڵکو مەعریفەت بریتییە لە پێشبینی کردنی ئەوەی کام هۆکار و پاڵنەر کام جۆر لە ئەنجام بەرهەم دەهێنن.. بانگەشەکردن بۆ هەبوونی فیراسەتێکی لەم شێوەیە لە ڕابردووی نزیکماندا یەکجار زەحمەتە. بەتایبەت لافی ئەوەی گوایە مافی ئیرادەمان داوە تابلێی نابەجێیە!. بەپێچەوانەوە، لەم سەردەمە تاریك و نووتەکەدا مرۆڤی ئێمە تەنانەت لە ئیرادەی خۆی و بیری خۆی و هەوڵی خۆی کەوتە گومانەوە.. هەربۆیە هەمیشە بەدوای ئیرادەگەلێکی بەرز و دەراسادا گەڕاوە تا ئیدارەی بکەن. لەمەش زیاتر، لە ڕێگەی تێبینییەکانی وەك "فلان بیرمەند، فلان زانا، فیسار وڵات، فیسار دەوڵەت.." شعوورە پاك و ویژدانە بێتاوانەکان لەسەر بێ ناسنامەیی و نەبوونی کەسایەتی تەڵقین

دراون و هەوڵ و کۆششەکان کوێت و بەند کراون.. وە بە تێپەڕبوونی کات ئەو فلان و فیسارانە، ڕەشۆی بیر و ڕەفتاری ئێمەیان گرت و لە ئێمەدا جۆرێك لە سەر سووڕان و لادان لە داوەریی ژیری و تێگەیشتنی لار و لوێر و توانەوەی کەسایەتییان هێنایە مەیدان. بەتایبەت لەو ڕۆحانەدا کە بێ قەید و شەرت خۆیان ڕادەست کردووە، تێکچوونێکی هێندە ترسناك ڕوویداوە کە شایانی چاکبوونەوە نەبێت. ئەمە لە حاڵێکدا کە جگە لە ئیرادەی خوا، هیچ ئیرادەیەکی تر نییە کە بێ لێکۆڵینەوە و نەشتەری ڕەخنە باوەڕی پێبکرێت و قبووڵ بکرێت.

دیکارت دەیوت "بیرکردنەوەیەك ئازاد نەبێت، بە بیرکردنەوە ئەژمار ناکرێت." بۆ ڕزگارکردنی ڕۆحمان لەو سیستەمە کۆنەپەرستەی بیرکردنەوەمان کە لە زۆر لاوە بۆگەنی کردووە و باوی نەماوە، ئایا بە لایەنی کەمەوە پێویست ناکات وەك دیکارت بیربکەینەوە؟ بەڵام هەیهات!

لە ساڵانی داهاتوودا، ئەو نەوە ڕووناکانەی خاوەنی ئاسۆی دنیایی-دوارۆژین، کاریگەریی بنەڕەتییان دەبێت لەسەر ئەو "پێکهاتن"ە نوێیانەی کە بێگومان هەر ڕوودەدەن. ئەم نەوە ڕووناکانە جارێکی تر چاودەخشێننەوە بەو بیرکردنەوە و یاسا و سیستەمانەی لە دەرەوەڕا خراونەتە ناومان و ئەوانەشیان کە لەناو خۆماندا سەریان هەڵداوە و، پێویستە هەرچۆنێکیان کردووە کۆمەڵگا لەو چڵکانە خاوێن بکەنەوە کە نامۆی دەکەن و، دیسان وابەستەی بکەن بە ڕەگەکانی مانای خۆیەوە. تا بتوانێت خود و کەسایەتی بپارێزێت و لەکاتێکدا ئاوێزانی جیهان بووە، لەسەر ڕاستەهێڵی تایبەت بە خۆی بەرەو ئایندە هەنگاو بنێت.. لەم ڕۆیشتنەشدا بتوانێت دوێنێ و ئەمڕۆ پێکەوە موتالابکات، ڕابردوو لەبەرئەوەی کۆنە فڕێ

نەدات، کوێرانە ئەو شتانەش قبووڵ نەکات کە پێی وایە تازە و نوێن.. بەڵێ، زانینی هەموو شتێك لەسەر ئەمڕۆ و سبەی پێویستە و تێگەیشتن لەو ڕاستییەی ئەو شتانەی پێویستە بیانزانین تەنها بریتی نین لەو شتانەی ئێستا کەم تا زۆر دەیانزانین، پێویستترە. لە پرۆسەی هەوڵدان بۆ تێگەیشتن لە حەقیقەتدا بە ئەندازەی گرنگیدان بە داتاکانی تاقیگە، گرنگیدان بە شەماڵەکانی ئیلهام و تێپەڕاندنی هەموو شتێك بە بێژنگی ژیری و لۆجیك و داوەریدا، دیارترین سیفەتی ئەم نەوە ڕووناکە دەبێت.

بۆ هێنانەدی پێشکەوتن و گۆڕانێکی لەم شێوەیە، ناسینی مێژووی نزیکمان و پاڵەوانە مێژووییەکانمان زۆر گرنگە. کێن ئەو پاڵنەر و کەسایەتییە هەرە گرنگ و کاریگەرانەی ڕۆڵیان هەبووە لە دروستبوونی مێژووی ئەمڕۆماندا؟ کێ بۆ دواین جار ئەوین و جۆش و خرۆشی هەبوونی لە سینەی ئوممەتدا بێدارکردەوە؟ کێ بەستەی ڕۆحی میللی ئامادەکرد و کام ڕۆڵەیەی نیشتمان هێنایە سەر زمان؟ پاش زانینی ئەمانە بەتەواوەتی، پێم وایە باشتر تێدەگەین لەوەی کام شتانە بکەین بە ئامانجی هەرە باڵامان و دەتوانین پرۆژە و نەخشەکانمان سەبارەت بە ئاییندە ڕوونتر بن. بەم جۆرە دەگەین بە بەختەوەریی ڕۆیشتن بە ڕێگای کۆمەڵێك مەردی قارەمانی وادا کە توانیویانە پەیام و عەشق و ئەخلاقی لێبووردن هەمیشە لە سینەیاندا بە زیندوویی بهێڵنەوە.

* * *

پەیوەندی و هەماهەنگیی نێوان بوونەوەر و ڕووداوەکان جەبرین، بەڵام پەیوەندی و ڕێسای نێوان مرۆڤەکان ئیرادین و تا ئەندازەیەکی زۆر لە ترس

و خۆشەویستییەوە سەرچاوە دەگرن. ڕێسا، ناوێکی تری بەرقەرارکردنی ئارامی و دڵنیایی و ئاشتیی کۆمەڵایەتی و داهاتووی گەشە بۆ کۆمەڵگا. هەروەك لە پشێویدا ئارامی و هەماهەنگی بوونی نابێت، لە زەمینەیەکی شەڕەنگێزدا ناوهێنانی بەرهەمهێنان و ئایندە شتێکی مەحاڵە.

هەرچەندە لە یەکەم ڕوانیندا وا دەردەکەوێت کە ڕێسا بەرهەمی ئیرادەی ڕووت و عەقڵی پەتی بێت، بەڵام عەقڵێك کە نەچووبێتە ژێر فەرمانی ڕۆحەوە و ئیرادەیەکیش کە مەیلی شەڕی تێدا وشك نەکرابێت و مەیلی خێر تیایدا باڵی نەگرتبێت، بەدرێژایی مێژوو زیاتر لایەنگریی پشێوییان کردووە وەك لە ڕێسا.

هەموو بوونەوەرانی تر جگە لە مرۆڤ، لەوەتەی دنیا هەیە هەمیشە لە ڕێسای دیاریکراوی خۆیاندان. لە جووڵەی پڕ لە دانایی گەردیلەکانەوە تا ڕوخساری ڕەنگاوڕەنگی گوڵەکان، لە گونجان و هەماهەنگیی نێوان ڕووەك و زیندەوەرەکانەوە هەتا ئەو ئەستێرانەی ئاسمان کە چاومان لێ دادەگرن و هەردەم چەشنی شیعرێك و مانەندی هەستێك دەڕژێنە دڵمانەوە، لە بۆنی ئەو مانایەی کە لە لق و گەڵا و گوڵی درەختەکانەوە بەرزدەبێتەوە، هەتا ئەو ژیانەی زیندوویەتی لێ دەتکێت، لە هەموو جێگایەك و لە گشت شتێکدا ڕێسایەکی سەرسووڕهێنەر فەرمانڕەوایە.

بەڵێ، ئەگەر ویژدان تەنانەت بۆ ماوەی یەك چرکەش لە کتێبی گەردوون بڕوانێت و هەڵیبسەنگێنێت، لە هەموو کونج و کەلەبەرێکیدا بۆنی خۆشی ڕێسا و هەماهەنگی و جوانی و ماناگەلی دەوڵەمەند دەبینێت. پێویست بە فرەهەستیارییەکی زۆر قووڵ ناکات، بەڵکو دڵێکی

کەمێك هەستیار، لە دەنگی ترسناکی هەورەگرمەکان و ئاوازی باڵندەکان و سیمای سیحرئامێزی گوڵان و ڕووناکییە ئەفسووناوییەکانی ئاسمان و هەموو ڕەنگ و شێوە و دەنگ و هەناسەیەکدا، دەتوانێت هەست بە هۆنراوە و زەمزەمەی ئەبەدییەت بکات.. ئەوانەش کە هەنگاوێك لەپێشترن، لە شەپۆلەکانی کیمیا و فیزیا و زیندەوەرناسی و ئەسترۆفیزیای بووندا، مەگەر خوا بۆ خۆی بزانێت چەند شتی تر دەبینن!. بەڵێ، لە لرفەی بەسامی دەریاکانەوە تا سەرسووڕهێنەری و سەرنجڕاکێشیی ئەو جێگا دوورەدەستانەی کە چەشنی "مزراب"[١] ژێیەکانی هەستمان دەهێننە گۆ، لە وەستانی پڕشکۆی شاخەکانەوە تا لوتکەی چیاکان، لە هاژەی بێسنووری دەریاکانەوە تا قووڵاییەکانی ئەو ئاسمانەی کە بە جاویدانی ڕەنگ کراوە، هەموو شتێك بە زمانی حاڵ "ڕێسا" دەڵێت و هاوار بۆ ئەو مانا فراوانانە دەکات کە لە ڕۆحی بووندان.

لەکاتێکدا هەموو جێگایەك و هەموو شتێك ڕێسای لێ هەڵدەقوڵێت، ئەدی ئەو پشێوییەی کە بریتییە لە نەبوونی ڕێسا، لە کوێوە هاتووەتە سەر زەوی؟ زەوی لەگەڵ مرۆڤدا پشێوی و ئەو نائەخلاقییەتەشی ناسی کە لە پشتی پشێوییەوەیە. لە ڕێگەی ئەو ئادەمیزادانەی کە نەیانتوانیوە ژێرییان ڕادەستی خوا بکەن و ئیرادەیان بەرامبەر بە شەڕ لاواز بکەن و هەستەکانی خێری تێدا بخرۆشێنن.. بەڵێ، مرۆڤ بوونەوەرێکی وایە کە کراوەیە بەڕووی چەندەها جۆری هەڵپەی جیاوازدا و خاوەنی کۆمەڵێك بۆشایی وایە کە لە هیچ بەدیهاتوویەکی تردا نییە. لە هەڵپە و ڕق و نەفرەت و توندوتیژی و شەهوەت و هەموو بۆشاییەکانی تریدا، هەستەکانی

---

١. مزراب: بریتییە لەو پارچە بچووکەی کە مۆسیقارەکان بەکاریدەهێنن بۆ ژەندنی ئامێرە تەلدارەکان.

کاولکاری لە شێوەی شەپۆلی جۆاوجۆردا و مەیلی ئاژاوەگێڕی و گەرداوی پشێوی نمایانە. هەتا مرۆڤ بە یارمەتی پەروەردەیەکی باش، جڵەوی ئەم هەستە خراپانە نەگرێت و پەرە بە هەستە مرۆییەکان نەدات و لە ویست-ئارەزوو، خۆشی-ناخۆشی، ماف-ئازادییەکاندا حساب بۆ هەبوونی کەسانی تریش نەکات و هەتا ئەو کاتەش کە ویژدان "بەڵێ" دەکات بۆ "گرێبەستێکی کۆمەڵایەتی"، مەحاڵە مرۆڤ ڕزگاری ببێت لە کۆمەڵێك دەرەنجامی خراپ.

ئەو پەروەردەیەی کە بڕیارە مرۆڤێتیی مرۆڤ لە دۆخی هێزەوە بگۆڕێت بۆ دۆخی کردار و بیگەیەنێت بە مرۆڤایەتیی ڕاستەقینە، بێگومان پێویستە ئاسۆی لاهوتی هەبێت و خاوەنی تەوەرەی "بەهرەی بەخشراو" بێت.. بەڵێ، پێویستە کلتووری ئێمە بەو گوڵانەی لە باخچەی ئێمەدان و بە شەربەتاوی ڕەگەکانی ڕۆح و مانامان گۆش بکرێت و هەروەها لەلایەن ویژدانی گشتی و شعووری مێژووەوە دژایەتی نەکرێت.. پێویستە ئەم گرێبەستە کۆمەڵایەتییەش گونجاوبێت لەگەڵ هەلومەرجەکانی سەردەمدا و پێشکەوتووترین ئاستی ماف و ئازادییەکان لەخۆبگرێت، تا توێژە جیاوازەکانی کۆمەڵگا نەکەونە تۆڕی دژایەتی و دوژمنایەتییەوە، تا لە بازنەی شەڕی کێبەرکێدا هێز و پایە و نرخ و شکۆی خۆیان بەزایە نەدەن... لێرەدا مەبەست لە گرێبەست ئەو ڕێکەوتنە ئاڵ و واڵایانە نییە کە لایەنەکان لەژێریدا واژۆ دەکەن، بەڵکو بریتییە لە ڕێزگرتنی چەمکی ماف و ئازادییەکان لەلایەن ئەو ویژدانانەوە کە چاویان بەڕووی بەها مرۆییەکاندا کراوەتەوە و خۆشەویستییان بەرامبەر بە حەقیقەت هەیە.

چوارچێوە و سنووری ئەم گرێبەستە، پێکهاتەی دڵی تاك و فراوانیی ڕۆحی و ئەو شتانەی باوەڕی پێیەتی و ڕەگداکوتانی باوەڕەکانی لە سروشتیدا، دیاری دەکات. لەم ڕووەوە گرێبەستی ویژدانیی هەر کەسێك، ئاستی مرۆیی ئەو دەردەخات. کۆمەڵگایەك پێکهاتبێت لە کەسانێك کە لەسەر ئاستی ژیانی دڵ و ڕۆح، جیسمانییەتیان تێپەڕاندووە، نموونەی کۆمەڵگەی خاوەن ڕێسایە. ڕێسایەکی لەم جۆرە لە جیهانی مرۆڤایەتیدا، لەو ڕووەوە کە دیوێکی ئەو یاسا و ڕێسا گشتییەشە کە هەموو گەردوونی گرتووەتەوە، سیفەتی مانەوەی دەبێت و خاوەنی داهاتوویەکی گەشە.

لە دنیای ئێمەدا دەوڵەت، وەکو کاپتنی کەشتییەك وایە. ئەرکی کاپتنێکی لەم جۆرە بریتییە لە هەڵسەنگاندن و بەکارهێنانی ئەوانەی ژێر دەستی بە باشترین شێوە و ڕێکخستنی گونجان و هاوسەنگی لەنێوان تاکەکانی کۆمەڵگا و ڕێسای گەردووندا و گەیاندنی ئەوان بە ئامانج و کەناری ئارامی، بێئەوەی خۆی بە تاشەبەردی ڕووداوەکاندا بدات. هەروەك لە کەسانێك کە مەحروومن لە فەزیلەت و لە شیو و دۆڵەکانی نائەخلاقیدا گیریان خواردووە، کۆمەڵگایەك و دەوڵەتێکی نموونەیی پێکنایەت، بە هەمان جۆر چاوەڕێ کردنی داهاتوویەکی ڕۆشن لەو حەشاماتە پشێوانەی کە بە هەزار و یەك دەردەوە گیرۆدەن، فریوخواردنە. لەبەرئەوە بە هەر شێوەیەك بێت و لەژێر هەر ناوێکدا بێت، چاوەڕێ کردنی ئیدارە و ئاشتی و ئارامی لەناو ئەم حەشاماتانەدا کە بە بەختی ڕەشی خۆیانەوە تەنها ماونەتەوە، تەنها خەون و خەیاڵێکە و باسکردنی دەسەڵات و دەوڵەتیش دڵنەواییەکی بێ بناغەیە. دەسەڵات و دەوڵەتی

ڕاستەقینە تەنها ئەو کاتە دێتە گۆڕێ کە ئامانجێکی باڵا ژیان بدات بە کۆمەڵگا و گۆشی بکات و هەموو شتێکی تر بەگوێرەی ئەو نەخشەی بۆ دابنرێت و لە دەوری ئەو بسووڕێتەوە، بەکورتی بەوە دەبێت کە هەموو جووڵە و هەوڵێك وەك سەرچاوە بگەڕێنرێتەوە بۆ "یەك"ێك.

بەڵێ، پێویستە هەموو تاکێك و هەموو بوارەکانی ژیان، بەجۆرێك بەرنامەڕێژ بکرێن کە ئامانجیان بەرزکردنەوەی ئوممەت بێت بەرەو لوتکەکان، تا سوود و بەرژەوەندییە بچووکەکان هەماهەنگیی گشتی نەشێوێنن و توێژە جیاوازەکان وەکو شەپۆلە زەبەلاحەکانی دەریا نەکێشن بەیەکدا و پارچە پارچە نەبن!. کاتی خۆی، لە سایەی فەرمانڕەوایی ڕۆحی ئیسلام بەسەر ژیاندا، توانراوە زۆر بەباشی ئەو ئامانجە هەرە باڵایە دەسنیشان بکرێت و لەو ڕووەوە کە تاکەکان و چینەکان بووبوون بە کۆڵەکەی بنەڕەتیی ڕێسا و یاسا، ئەوا سەرکەوتن بۆ لوتکەکان، وەك بڵێی بووبوو بە دەرەنجامێکی ئاسایی و سروشتی.

گەورەترین دیاری نەوەکانی ئەمڕۆ بۆ جیهانی سبەی، بریتی دەبێت لە: سەرلەنوێ چاوخشاندنەوە بە بیرکردنەوەماندا دەربارەی ڕێسا، تازەکردنەوەی باوەڕی ئەوەی کە حیکمەتی گشتگیریی خوایی لە ڕێگەی ئیرادەکانی ئێمەوە دەگوازرێتەوە بۆ جیهانی مرۆڤ و، کردنی ئەمەش بە تەوەرە و خولگەی هاوسەنگیی نێوان وڵاتان و دەوڵەتان. پێم وایە پێداچوونەوە بە حاڵی ئیرادەماندا و دەستنیشانکردنی پێگەمان لە بەرامبەر خوای گەورەوە و دیاریکردنی ئامانجە میللییەکانمان و هەڵبژاردنی شێواز و ستراتیژی گونجاو و بەگەڕخستنی ئەو پاڵنەر و دینەمۆیانەی کە خاوەنیانین، بەسە بۆ هێنانەدی فەرمانبەرییەکی گرنگی لەم جۆرە.

# تاکە دۆز و کێشەی ئێمە

لەم ڕۆژانەدا کە هەموو دنیا وردە وردە بەرەو بەهار هەنگاو دەنێت، سەرەڕای کۆمەڵێك کێشە و گرفت لە ڕوانگەی مێژووییەوە، هەمووان کۆکن لەسەر ئەو ڕاستییەی کە ئاینده ڕووناك دەبێت. بەڵام کەسایەتیی ئەوانەی کە بە هێز و ئیرادە و هەوڵی بێسنووریان ئەم "پێکهاتن"ە نوێیە دەخولقێنن -ئەم پێکهاتنەی کە ڕووداوێکی مەزنی جیهانیشە لە هەمان کاتدا- بابەتێکە شایەنی باسکردن و هەڵوێستە لەسەر کردنە. هیچ گومانێك لەوەدا نییە بیرکردنەوە لە داهاتووی ئەم نیشتمانە ئەرکی سەرشانی هەموو ڕۆشنبیرێکە. ئەوەندە هەیە نازانم داخۆ هەمووان هەست بەم بەرپرسیارێتییە دەکەن یان نا، بەڵام بەدڵنیاییەوە دەزانم کە لەمێژە لەم نیشتمانەدا مشتێك مرۆڤ، لە هەستان و دانیشتنیاندا بە بەردەوامی خولیای ئاینده لە سەریاندا بووە و بە هیوای گەیشتن بەو ڕۆژانەی ڕێگاکان دەگەن بە تەختی، شەو و ڕۆژیان ناوەتە سەر یەك.

ئەم خاك و نیشتمانانەی کە سەردەمانێك ملیۆنان کەس بە شێوازی جۆراوجۆر لەپێناویاندا گیانیان سپاردووە، ئەمڕۆش لە سایەی زۆرێك لە نەوە وەفادارەکانی، لە هەیەجانی تێپەڕیندایە لە ڕابردووەوە بەرەو داهاتوو..

بەجۆرێك کە تەژین لە ئومێد و خەیاڵی بەرزکردنەوەی نیشتمان، وەکو تایەك لێیان هاتووە. بەجۆرێك هەریەك لەمانە لەکاتێکدا بە دەستێك و بە قاچێکیان سەرقاڵی ژیانی ڕۆژانەن، دەستەکەی تر و قاچەکەی تریان، تەنانەت هەست و شعووریشیان خستووەتە ژێر فەرمانی ئامانجە نموونەییەکانەوە و هەوڵی داڕشتنی نەخشە و پرۆژەکانی داهاتوو دەدەن. لەم ڕووەوە دەتوانرێت بوترێت کە سەرلەنوێ ئەو تاکە کێشە و دۆزەی کە مێژوویەکی مەزن و پڕشکۆ و نەتەوەگەلێکی زیرەك و وریا، بەدرێژایی هەزاران ساڵ پاراستوویانە و گەشەیان پێداوە، ئەم دۆزە جارێکی تر و لە شێوەی ئەوینێکدا لە ڕۆحەکاندا دووبارە گڕی گرتووەتەوە. بەڵێ، زۆربەی نەوەکانی ئەمڕۆ هاوڕێ لەگەڵ هەستی یەکێتی و یەککگرتوویی و خەبات کردن لەپێناو کردنی ئوممەتەکەیان بە یەکەم نەتەوەی دنیا، هەم وەك هێما و هەم وەك نوێنەری ئەم فەرمانبەرییە مەزنە وان. ئەگەر ڕەشەبایەکی پێچەوانە هەڵنەکات و هەموو شتێك نەپێچێتەوە، پێدەچێت ببێت بە خێوەتی هەمیشەییشیان.

ئەم دۆزەی کە لەگەڵ مرۆڤە یەکەمینەکانی ئیسلامدا شاباڵی گرت و لە ماوەیەکی زۆر کەمدا بە هەر چوار لای دنیادا بڵاوبوویەوە، پاش تێپەڕینی بە چەند وێستگەیەکی تردا و هەرچەندە لە ماوەیەکی دیاریکراودا دووچاری بەدبەختییەکی زۆر سەختیش هات، ئەمڕۆ دیسان لە شار و گونددا، لەناو خێزان و دەوڵەتدا، لە کۆڵان و قوتابخانەدا، لە هونەر و زانستدا، لە کار و ئەخلاقدا بە تافی ژیانەوەیدا تێدەپەڕێت و لە سایەی ئەوانەدا کە هەیەجانی ڕۆحی وڵاتیان بەئاگاهێناوەتەوە و ئارایشتیان داوە و بە فرمێسکەکانیان پاراویان کردووە، سەرەڕای هەموو ناخۆشییەکان، هەر

لە ئێستاوە مژدەی سپێدەیەكی ڕۆشن دەدەن. هەرچەندە یەك لەسەر یەك چەندین سپێدەی درۆزن فریویان داوین، وەلێ ڕاستگۆترین شایەت لەسەر ئەوەی بەم نزیكانە خۆر هەڵدێت، هەر ئەم سپێدانەن.

ئەو هەڵپەكردن بۆ ماددە و خۆشەویستیی پلە و پایە و حەزی ژیان و چێژی ناوبانگ و ترسی لەدەستدانی خۆشییەكانی دنیا و بابەتەكانی تری هاوشێوەیان كە لە سەردەمێكی شوومدا جێگەی دۆز و ڕۆحی ئێمەیان گرتەوە، یان لەبری پیرۆز ڕاگرتنی نزمترین و بچووكترینی شتەكان، ئەمڕۆ ئیدی شتانێك كە خولگەیان ڕۆح و مانایە شوێنی ئەمانەیان گرتووەتەوە. بەڵێ، لەبری ئەو كاڵفامانەی دوێنێ و فەنتازیاكانیان، كە بە ناوی ڕزگاركردنی وڵات و گەیاندنی نیشتمان بە پێوەرە ڕۆژئاواییەكان، هەمیشە دەمیان بادەدا و هەرچەندە وا دەردەكەوتن كە كار دەكەن، بەڵام لەڕاستیدا پاڵیان لێ دابووەوە و چەقیبوون، ئەمڕۆ لە جێگای ئەمانەدا تا ئەندازەیەكی زۆر نوێنەری زانست و هونەر و ئەخلاق و فەزیلەت هەن، یان كۆمەڵێك میراتگری وا هەن كە هەڵگری هەموو بەهاكانی ڕابردوون و كاندیدن بۆ وەها نوێنەرییەك.

گەرچی لە هەندێك لە مەیدانەكانی سیاسەت و گۆڕەپانی بەرژەوەندییەكان و زەمینەی سوودە كەسییەكاندا پێكدادانی زۆر توند هێشتا هەر بەردەوامە.. وە بەشێك لەمانە بە بیانووی "با نیشتمان ڕزگاربكەین"، "با مرۆڤی خۆمان ڕۆشنبیر بكەین"، "با وڵاتمان ئاوەدان بكەینەوە" و، دروشمەكانی تری هاوچەشنیان، هەمیشە هانی هەڵپە و ئارەزووەكان دەدەن و ئوممەت بەرەو قەیران و پشێوی ڕاپێچ دەكەن. وەلێ تكاتان لێ دەكەم، ئایا دەكرێت سەردەمێك لە مێژوودا نیشان بدەن

کە ئەم جۆرە پێرانەی تێدا نەبووبێت؟ ئەمانە هەمیشە بوونیان هەبووە، ئەمڕۆش هەن و سبەینێش هەر دەبن. بەڵێ، هەمیشە مێژوو، لەپاڵ مرۆڤە باشەکاندا، مێژووی ئەوانەشە کە جوێن بە یەکتر دەدەن و، یەکتر کرمۆڵ دەکەن و، چاڵ بۆ یەکتر هەڵدەکەنن و، خیانەت لەیەکتر دەکەن و، بوختان و درۆ بۆ یەکتر هەڵدەبەستن. چ پێویست بە قسەی دووردرێژ دەکات؟ ئەگەر ئاورێك لە ڕابردووی نزیکمان بدەینەوە، دەبینین چەند جار ڕۆحەکان لەژێر ناوی دیموکراسیدا کوژراون و چەند کەڕەت چینە جیاوازەکانی کۆمەڵگا کراون بە گورگ بۆ یەکتری و چەند جار لە ڕێگای دەزگا فراوانەکانی ڕاگەیاندنەوە شەربەتی قین و نەفرەت و دوژمنایەتیمان دەرخوارد دراوە.

بەڵێ، سەبارەت بە هەندێك بەشی کۆمەڵگا و لە هەندێك بابەتی دیاریکراودا، ئەو کردارانەی ئەمڕۆ ئەمانە دەیکەن لەگەڵ ڕابردوودا و ئەوانەش سبەینێ دەیکەن بەراورد بە ئەمڕۆ، هیچ جیاوازییەکی نییە. تەنانەت لە خاوێنترین و نموونەییترین کۆمەڵگاکانیشدا، هەمیشە دەستەیەك ڕۆحی ڕەش هەبوون کە فریودەرن و خەڵکی بەش بەش دەکەن، کەسانی تر بەکاردەهێنن و مافیان دەخۆن، وە هەمیشە دەمامکی ڕوخساریان دەگۆڕن و دەزانن چۆن خۆیان بشارنەوە. لە داهاتووشدا هەر دەبن. بەڵام لەپاڵ ئەمانەشدا ئەوە ڕاستییە کە دنیایەك مرۆڤی دروست و هەوڵی پەسەندیش هەن...

ئەمڕۆ ئەو هەوڵی پەروەردەکردن و خۆشەویستی و لێبوردەیی و پێکەوەژیانەی کە لەژێر ناوی جۆراجۆردا دەدرێت، لەڕاستیدا لە ڕووی کۆکردنەوەی پارچەکانی کۆمەڵگا لە دەوری یەك و بەگەڕخستنی

سەرچاوەی هێزە مەعنەوییەکانی، هەڵمەتێکی زۆر گرنگە... وە ئەمە لە دەستی ئەو نەوە باوەڕدارانەدا کە ورەی مێتافیزیکییان تەواو و پڕە، بەسە بۆئەوەی جارێکی تر پاڵ بە کەشتیی لەنگەرگرتووی ئوممەتەوە بنێن و بیخەنەوە دەریای پێشکەوتن. ئەو نەوانەی ئەمڕۆ کە لەسەر ئاستی کەسایەتی و ڕۆح زۆر پەشۆکاون و لە بەها مرۆییەکانی وەك فەزیلەت و ڕەوشت و بیر و هونەردا تامی دۆڕانی یەك لەدوای یەکیان کردووە، نابێت هیچ گومانێك لەوە بکرێت کە لە سایەی سەربەستیی ڕۆح و دامەزراویی فیکردا دەگەن بە "زیندووبوونەوەی دوای مردن".

سەدەی نۆزدە و بیست سەبارەت بە ئێمە چەرخی هەڵوەشان و دواکەوتن بوو. ماوەیەکی دوورودرێژ هەست بە هۆکارە ڕاستەقینەکانی ئەم دواکەوتن و هەڵوەشانە نەکرا، یان بە ئەنقەست بیرەکان بەلاڕێدا بران. لە ئەنجامدا، لە دین و زانست و هونەر و بیرکردنەوەدا شاکاری دواکەوتن داهێنران و تەنانەت هەندێك لە تەوژمە فیکرییەکان، بەهۆی تۆزێك فەنتازیا و هەندێك سەرسامی، بە تێپەڕبوونی کات گۆڕان بە تەوژمی ئیلحاد و ئینکار. تا کار گەیشت بەوەی کە تەڵەکەبازی لەبری زیرەکیی زانستی و بەهەڵەداچوون لەجیاتی ڕۆشنبیری و عەیبدارکردنی کەسانی تر لە شوێنی کار و چالاکی و پرۆژە، بوو بە مۆدە. کۆمەڵانێك کە فێڵیان بە هونەر دەزانی، لە ڕێگەی بوختان و تەزویر و درۆوە، هەوڵێکی چڕوپڕیان دا بۆ ڕووخاندنی ڕاستییە مێژووییەکان.. بەڵام وەرن و جیلوەی قەدەر ببینن، تەنانەت هەنووکەش ئەو پاڵنەرە مێژووییانە و ڕەگەکانی مەعنای ئوممەت ڕێك و قنج بەپێوە وەستاون و ئەوەی گرفتاری ڕووخان و نەمان بوویەوە خۆیان بوون.

بەڵێ، ئەم میللەتەی کە لە ئێستادا جارێکی تر چاوی کراوەتەوە بەڕووی ڕاستەهێڵی پێغەمبەرەکەیدا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، بۆنی خۆشی شنەبای بەهارانی لێ دێت و لە گشت جێگایەکیشدا گوڵەبەفرینەکان[1] مژدەی لەدایکبوونەوەیەکی نوێمان دەدەنێ. بەڵێ، ئیدی ئەمڕۆ، ئەگەرچی تا ئەندازەیەکیش بێت، هاتووینەتەوە هۆشی خۆمان و خۆمان دۆزیوەتەوە. ئەمەش هیوا و خۆشییەکی وامان پێدەدات کە بتوانین پتەوتر و دامەزراوتر دەربکەوین.. هیوادارم، لەمەودوا هەر هەوڵ و کۆششێك کە دەیدەین و هەر فرمێسکێك کە دەیڕێژین، ببن بە شیفای زامە بیمارەکانمان و ببن بە ڕووناکیی ئەو داهاتووەی کە لە چاوی هەندێکمانەوە وەك دەیجوور دیارە!

هەنووکە کاتێك دەچینە سەدەی بیست و یەکەمەوە، داهاتووی وڵاتی ئێمە و ئەو نەتەوانەی تریش کە پەیوەندییان بە ئێمەوە هەیە، لەژێر سایەی باڵە نوورینەکانی ئەو سوپای ڕووناکییەدان کە نوێنەرانی بەرزی زانست و فەزیلەت و ڕەوشتن و زۆربەیان خۆیان بۆ کاری پەروەردە و فێرکردن تەرخان کردووە. پشت بە خوا ئەم نەوە پیرۆزانە، لەگەڵ ئەوەدا کە هەموو ئەو بەها مێژووییانەی لەدەستمان داون بۆمان دەگێڕنەوە و لە بابەتی تەسفییەکردنی حسابمان لەگەڵ سەردەمدا، دەبن بە ڕابەرانی بیر ڕووناك و دەنگ ڕووناکی ئێمە.

خۆی لە خۆیدا پەیام و مەبەست و ئامانجی ئێمە هیچ پەیوەندییەکی دوور و نزیکی لەگەڵ هێز و کوتەکدا نییە. ئێمە، هەرچەندە دەزانین

---

١. مەبەست لەو یەکەمین گوڵانەیە کە لە کۆتایی زستاندا و پێش هاتنی بەهار لەناو سەرما و سۆڵەدا سەردەردەهێنن و وەك هەواڵدەر و مژدەدەری بەهار وان.

ئەو هێزەی ملکەچی حەقە حیکمەتێك لە بوونیدا هەیە، بەڵام لەپاڵ شێوازی فراوانی بیرکردنەوەمان و ئەو تێگەیشتنە بەتام و چێژەمان لە هونەر و ئەو هۆگرییە توندوتیژەش کە هەمانە بۆ "سەرخستنی حەق"، باوەڕمان بە "پێویستی" تەکنیك و تەکنەلۆجیا و پیشەسازی هەیە و لە دڵەوە ڕێز لە نرخی بەرزی زانست دەگرین و لەو باوەڕەداین کە پێویستە بە هەر هۆکارێك بووە نیشتمانمان بەم شتانە گۆش بکەین. بۆ ئەمەش ئێمە ئەمڕۆ لە هەر شتێکی تر زیاتر پێویستمان بە دەماغگەلی بلیمەت و فیکری گشتگیر و پێشەواگەلێك هەیە کە خاوەنی ئاسۆی فراوان بن، تا بەناوی وڵات و مرۆڤی ئێمەوە ئەم هاوسەنگییانە بسازێنن و نەتەوەکەمان بگەیەنن بە لوتکەکانی هزر و ئاڕاستەمان بکەن بەرەو ڕەگەکانی مەعنامان و دەستپێکی کرانەوە بەڕووی ئەبەدییەتدا ببەخشن بەو ڕۆحانەمان کە موشتاقی بەرزی و مەزنییەکانن.

بەڵێ، ئەم وڵاتە لە حیزب و حیزبایەتی زیاتر، پێویستی بە پاڵەوانگەلێکی وا هەیە کە حەواریی زانست و ڕەوشت و فەزیلەت بن و بە ئیمان و ئومێد پڕچەك بووبن و لێوانلێوبن لە ئەوین و هەیەجان و، ڕزگاریان بوویێت لە ڕق و قینە ماددی و مەعنەوییەکان و دنیایی و دوارۆژییەکان. وا پێدەچێت تا ئەو کاتەی بەوان دەگەین و تەسلیمیان دەبین، گەر بە شێوەیەکی ڕێژەییش بێت، ئەم غوربەت و دیلێتییانەی ئێستامان هەر بەردەوام بن. لە خوای خاوەنی ڕەحمەتی بێسنوور داواکارین ئەو ئەمرانە بنێرێت بە هانامانەوە کە کانیی "خضر"یان دیتووە و کاسەی ژیانی ئێمەیان بەدەستەوەیە و ساڵانێکە بە بینینی نیشانەکانیان لە ئاسۆدا، دڵی خۆمان دەدەینەوە...

## ئەوە نموونەییەکان

لەم سەروەختەی ئێستاماندا کە لە عەرەفەی ڕۆژانی جوان و درەخشاندایین و سپێدەکان بۆنی جەژنیان لێدێت، ئەوەش حەقیقەتە کە کۆمەڵێك قەیرانی وامان هەیە تێپەڕاندنیان وەك ئەستەم دیارە. وەکو چۆن کێشە کۆمەڵایەتی و نەخۆشییە میللی و کارەساتە سروشتییەکان بە چارەسەری ڕۆژانە و ماوەکورت چارەسەر نابن، ئەو قەیرانانەش کە جەستەی میللەتیان تەنیوە بە هەمان جۆرن. هەربۆیە چارەسەرکردنی قەیرانەکان، بەندە بە بڵاوبوونەوەی بەسیرەت و زانست و حیکمەت لەسەر ئاستی کۆمەڵگادا. ئەگینا بەپێچەوانەوە، هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنی ئەم جۆرە تەنگژانە لە ڕێگەی مانۆڕ و خۆدەرخستنە سیاسییە ڕۆژانەکانەوە کە بێ ئامانج و بێ ئاسۆن، جگە لە بەفیڕۆدانی کات هیچ سوودێکی تری نابێت. لە دوێنێوە هەتا ئەمڕۆ، مرۆڤانی خاوەن ڕۆح و مانا و بەسیرەت، بە یارمەتیی بەکارهێنانی ئاسۆی فراوان و هیممەتی بەرز و بەگەڕخستنی سەرچاوەکانی هێزی ئەمڕۆ لەپێناو ئایندەدا، توانیویانە هێندە بەئاسانی بەربڵاوترین کێشە و تەنگژەکان چارەسەربکەن کە سنووری تەسەووەرەکانمان دەبەزێنێت. ئێمە زۆرجار هەڵسوکەوت و بیرکردنەوەی بلیمەتانەی ئەوانمان بە شتێکی سەروو ئاستی مرۆڤ

زانیوە و لە بەرامبەریاندا حەپەساوین. کەچی لەڕاستیدا ئەوەی ئەوان کردوویانە هەمان ئەو شتانە بوون کە هەر مرۆڤێکی تری سەرکەوتوو دەیکات، ئەویش هیچی تر نییە جگە لە بەکارهێنانی ئەو توانا و لێهاتنانەی کە خوای گەورە بە مرۆڤی بەخشیوە، هەتا دوا سنوور و چوارچێوەی خۆیان.

بەڵێ، ئەوان لە هەستان و دانیشتنیشیاندا، بەئەندازەی ئەمڕۆ، بە خەمەکانی داهاتووشەوە سەرقاڵ دەبن.. وە هەموو هەلومەرج و تواناکانی حاڵی حازر وەك پردێك بەکاردەهێنن بۆ گەیشتن بە داهاتوو و لە هەناسەبڕکێدان، بە ئومێدی ئەوەی ئەمڕۆ بگوازنەوە بۆ ئاینده.. چونکە چارەسەرکردنی کێشە، کەمێك پەیوەندی بە تێپەڕاندنی ئەم کاتەی ئێستاوەیە کە تیایداین، ڕاستتر بڵێین بەندە بە بەرزبوونەوە بەسەر کاتدا.. بەجۆرێك کە دوێنێ و ئەمڕۆ و سبەی بە هەمان ڕوونی ببینین. ئەم بیرکردنەوە فراوانەی کە بریتییە لە باوەشکردنی سبەینێ لە ئەمڕۆدا و تێگەیشتن لە ڕۆح و مانا و ناوەرۆکی ئاینده، ئێوە ئەگەر پێتان خۆش بێت دەتوانن ناوی "ئامانجی باڵا"یشی لێ بنێن. کەسێك خاوەنی ئاسۆیەکی لەم شێوەیە نەبێت، نە دەتوانێت سەربکەوێت بەسەر ئەم هەموو کێشانەدا و نە دەتوانێت پەیمانی هیچ شتێکی باشمان پێبدات لەسەر ئایندەمان. نە زرق و برقی سەرسووڕهێنەر و نە ژیانی پڕ لە ژاوەژاوی فیرعەونەکان و نەمرودەکان و ناپلیۆن و سیزارەکان -ئەگەرچی هەندێك ساوێلکە بەلایانەوە گەورە بێت- هەرگیز خاوەنی داهاتوو نەبوون و ئایندەیەکی گەشیان نەبووە.. بێگومان نەیاندەبوو، چونکە ئەمانە حەقیان خستبووە ژێر فەرمانی هێز و بەرژەوەندییان کردبوو بە چەقی پەیوەندییە

کۆمەڵایەتییەکان و دەستەیەك داماوی وابوون کە ژیانیان بە بەندایەتی کردن بۆ نەفسانییەت بەسەربردووە.

ئەمە لەکاتێکدا کە سەرەتا خەلیفە ڕاشیدەکان و ئەوانەی دوای ئەوانیش، لەڕووی ئەنجامەوە، بەرهەم و شوێنەواری وایان هێناوەتە گۆڕێ کە دنیایان بەرەو عوقبا تێپەڕاندووە و ئەم بەرهەمانە سەبارەت بە کەسانێك کە بە دابڕان و خۆرگیرانە کاتییەکان ناخەڵەتێن، توانای ئەوەیان هەیە پێشبڕکێ لەگەڵ سەردەمی ئێستادا بکەن.. بەڵێ، گەرچی ئەوان ژیانێکی پڕاوپڕ و لێوانلێو ژیان و تێپەڕین، وەلێ هەمیشە لە دڵاندا وەك یادێکی جوانی جاران دەمێننەوە.

سیزار ئامانجی باڵای ڕۆمای خستە ژێر پێی هەوا و هەوەسی خۆیەوە و ناپلیۆن خەونەکانی فەڕەنسای مەزنی لە داوی هەڵپەکانی خۆیدا زیندانی کرد و هیتلەریش ئاواتەکانی ئەڵمانیای مەزنی بەهۆی سەرکێشییە شێتانەکانییەوە لەگۆڕنا. بەڵام قارەمانێتییەکانی ئەم ئوممەتە سیفەتی تەواوی و بەردەوامییان هەیە و، لە هەر چەشنە سووکی و نزمییەك بەدوورن و، باوەڕ و ئیمان لە سەرکەوتن و لە ژێرکەوتنیشدا گیانی لەپێناودا بەخشراوە و، وەك ئاڵایەك بەرز ڕاگیراوە.

ئامانجی باڵا لە دەستی مرۆڤی خۆیدا بەهای بێسنووری دەست دەکەوێت و دەبێت بە کانگای سیحری سەرکەوتنەکان. ئەگەر ئەوانەی نوێنەرایەتی ئەم ئامانجە باڵایە دەکەن شایانی هەڵگرتنی نەبن، لەوە دەردەچێت کە "ئاڵا" بێت، بەڵکو دەبێت بە پارچە پەڕۆیەك کە لەژێریدا هاوار بۆ هەڵپە و تەماعە بێ جێ و سووك و ناسازەکان دەکرێت. ئەگەر پارچە پەڕۆیەکی لەم شێوەیە منداڵانی گەڕەك کۆبکاتەوە و

ئاراستەیان بكات بۆ هەندێك ئامانجی یاری ئاساش، هەرگیز بەس نییە بۆ بەدیهێنانی هەستە قووڵەكانی ناو ڕۆحی میللەت.

پێش لە هەر شتێكی تر مرۆڤی خاوەن ئامانجی باڵا مرۆڤی خۆشەویستییە. ئەو، وەك شێت خوای خۆشدەوێت و لەژێر باڵە فراوانەكانی ئەو خۆشەویستییەشدا هەست بە جۆرە پەیوەندییەك دەكات لەگەڵ هەموو بوونەوەراندا. هەموو كەسێك و هەموو شتێك لەباوەش دەگرێت.. دەست بە سەری منداڵاندا دەهێنێت و بۆنیان دەكات، وەك ئەوەی چرۆیانی داهاتوو بن.. ئامانجی بەرز نیشانی گەنجان دەدات و ئامۆژگارییان دەكات مرۆڤی نموونەیی بن.. ڕێزی شایان لە پیران دەگرێت و خزمەتیان دەكات.. بەدوای ڕێگایەكدا دەگەڕێت بۆ دیالۆگ و پێكەوەژیان لەگەڵ هەموو كەسێكدا.. كەندەڵانی نێوان چینە جیاوازەكانی كۆمەڵگا لە ڕێگەی ئەو پردانەوە كە بنیاتی ناون پڕدەكاتەوە و شەو و ڕۆژیش لە هەوڵی ئەوەدایە ئەوانەیان كە تا ڕادەیەك دەگونجێن و لەیەك تێدەگەن، بەتەواوەتی لە یەكیان نزیك بخاتەوە.

مرۆڤی خاوەن ئامانجی باڵای ڕاستەقینە، لە هەمان كاتدا لە بواری حیكمەتیشدا قارەمانە. ئەو كاتێك لەلایەك هەموو شتێك بە هێزی ژیری تەماشا دەكات، لە هەمان كاتدا بە پێوەرە نرخشناسەكانی دڵ دەیپێوێت و بە كێشانەی ئەندازەكاری و سەرنجداندا تێیدەپەڕێنێت و لە مەنجەڵی داوەریی ژیریدا دەیكوڵێنێت و شكڵ و شێوەی پێدەدات و هەمیشە تێدەكۆشێت ڕووناكی ژیری و نووری دڵ پێكەوە بەكاربهێنێت.

مرۆڤی خاوەن ئامانجی باڵا نموونەیەكی بەرجەستەی بەرپرسیارێتییە

بەرامبەر بەو کۆمەڵگایەی تێیدا دەژی. لەپێناو گەیشتن بە ئامانجەکەیدا -کە یەکەم مەبەستی ڕەزامەندیی خوایە- ئامادەیە هەموو ئەو شتانەی خوای گەورە پێی بەخشیوە بێ دوودڵی فیدایان بکات.. هەورەك لە هیچ شتێك ناترسێت و سڵ لە هیچ شتێك ناکاتەوە، دڵیش بە هیچ شتێکی تری جگە لە ئەو نادات.. لە خەیاڵی ئەودا نە حەزی بەختەوەری هەیە، نە ترسی بەدبەختی. ئەو مەردێکی هێندە ئازایە کە ئەگەر پەیامەکەی و نیشتمانەکەی پایەدار بن، ئیدی گوێ نادات بەوەی تەنانەت لە بڵێسەی دۆزەخیشدا بسووتێت.

مرۆڤێکی خاوەن ئامانجی باڵا، ڕێزگرتن لەو بەهایانەی دڵی پێیان داوە بە داخوازیی باوەڕەکەی دەزانێت و مانەندی نەشوەی عیبادەت ڕاپاندەپەڕێنێت و هەمیشە وەك مرۆڤێکی خاوەن عەشق و هەیەجان دەژی. دەزانێت چۆن لەپێناو ئامانجە باڵاکەیدا گیان و خۆشەویست و سەروەت و سامان و منداڵ و ئەمڕۆ و سبەینێی خۆی بێ بیرکردنەوە فیدابکات و لەگەڵ ئەوەدا کە بەوپەڕی وردی و جددییەتەوە ڕەچاوی حەق و حەقیقەت دەکات، هەمیشە بە قازانجی ئامانجە باڵاکەی بڕیار لەسەر بژاردەکانی بەردەستی دەدات. ئەو، لە بەرامبەر نەفسی خۆیەوە حاکم و لە ئاست حەقیقەتیشدا خۆی بە مەحکوم دەزانێت. پلە و پایە بە خەیاڵیدا نایەت و ناوبانگ و خۆپەرستی و حەزی پاڵدانەوە و شتانی تری هاوچەشنیان بە ژەهری کوشندە دەزانێت و لە قووڵاییەکانی ناخیدا هەمیشە لە مشتومڕدایە لەگەڵ نەفسیدا. ئەو هەمیشە دەیباتەوە، وەلێ تەنانەت کاتێکیش دەدۆڕێت، ئەم دۆڕانانە دەگۆڕێت بە چەند مەیدانێکی ڕاهێنانی هونەری بۆ سەرکەوتنەکانی داهاتوو.

کاتێك بەم ڕێگا مەزنەدا تێدەپەڕێت، ئەوەندە لە دڵەوە وابەستەی ڕەزامەندیی خوایە کە ئەو تۆفانانەی هەڵپە و تاوان کاتێك دێن و بەری دەکەون، لەودا هێندەی تر هەستی حەقپەروەری چەسپاوتر دەکەن و زریانەکانی ڕق و قین و نەفرەتیش، لەودا فوارەی خۆشەویستی و شەفەقەت دەتەقێننەوە. وە ئای چەند نیعمەت هەن کە خەڵکانی ئاسایی پێیانەوە دەبەسترێنەوە و ئەم لایان لێ ناکاتەوە، چەند نیقمەت و نارەحەتیش هەن کە ئەم سنگی خۆی دەکات بە سەنگەر لە بەرامبەریانەوە! کاتێك بە یارمەتیی ئاسۆی ڕاستەقینەی -ئەو ئاسۆیەی کە سەرساممان دەکات- ئەو بیردەکەینەوە، لەبەر چاوماندا خەبات و هەوڵی پێغەمبەرانە دەبینین و لە دەرگای خەیاڵیشمانەوە وێنەی سەروو مرۆیی بەرەو هەستەکانمان هورووژم دێنن و خەیاڵدانمان بە قارەمانێتییە مێژووییەکان کەف و کوڵی تێدەکەوێت.. وەفا و دڵسۆزیی "عوقبەی کوڕی نافیع" لە بیابانەکانی ئەفریقادا تەزوو بە جەستەماندا دەهێنێت.. هاودەم لەگەڵ نازایەتی و چاونەترسیی "تاریقی کوڕی زیاد" لەودیو گەرووی جەبەل تاریقەوە لەهۆشی خۆمان دەچین.. سەرسامانە تەماشای خەبات و دامەزراویی "فاتیح" دەکەین.. بە ڕێزەوە ئەو شمشێرە ماچ دەکەین کە لە "پلەونە" خۆی بەدەستی دوژمنەوە نەداوە.. وە لە کۆتاییدا بەڕێزەوە سڵاو لە شێرەکانی "چەناق قەلعە"[1] دەکەین، ئەوانەی کاتێك گوللە و تۆپ بەسەریاندا دەباری، بە پێکەنینەوە پێشوازییان لێدەکرد.

بەڵێ، ئێمە ئەمڕۆ نەك بەم و بەو، بەڵکو پێویستمان بە دەستەیەك

---

١. بریتییە لە ناوی ئەو جەنگەی کە موسڵمانانی تورکیا دژی داگیرکاران وەستانەوە و لە هەمان کاتدا بە جەنگی سەربەستیش بەناوبانگە.

مرۆڤی خاوەن ئاسۆی فراوان هەیە کە لە چەند کەسایەتییەکی بەرز و مەزندا بەرجەستە بووبن. سەرلەنوێ دامەزرانەوەی ئوممەتەکەمان لە سالآنی داهاتوودا، لە سایەی ئەم پالەوانی ڕۆح و مانا و ئەم مرۆڤە خاوەن ئامانجە بالآیانەدا دەبێت. ئەو مەردانەی کە هەوێنی بوونیان ئیمان و ئەوین و حیکمەت و بەسیرەتە، سەرەڕای ئەم هەموو هێرشە ناوخۆیی و دەرەکییانەی نۆ یان دە سەدەی ڕەبەقە دەکرێنە سەریان، هەرگیز نەچەمیونەتەوە و نەلەرزیون، لەوانەیە تۆزێك پەشۆکابن، بەلآم ئەوەندەی تر پتەوییان بەدەستهێناوە و گەیشتوونەتە ئەو ئاستەی حسابی خۆیان لەگەڵ ئایندەدا یەکلایی بکەنەوە و، ئەوەتا ئەمڕۆ هاوڕێ لەگەڵ هێزێکی نائاسایی ڕۆحدا ئامادەن بۆ وەرگرتنی نۆرەی خۆیان و لە چاوەڕوانییەکی ئامادە و چالاکدا چاودێریی ئەم ڕۆژگارە دەکەن.

بەڵێ، ئەوە ڕاستە کە ئەم چەند سەدەیەی کۆتایی، عەشق و حیکمەت و بەسیرەت و بەرپرسیارێتی لەناوماندا بچووك بووەتەوە و چووەتەوە یەك و هەندێك بابەتی بێبایەخی ڕۆژانە، شوێنی ئامانجی بالآی ئوممەتی پڕکردووەتەوە. بێگومان لەم ماوەیەدا ناکرێت باس لەوە بکەین کە شتێکی نوێمان هێناوەتە مەیدان. بەڵێ، ئەو شتانەی لەم ماوەیەدا بە ناوی نوێگەری خراونەتە گۆڕێ، تەنها لە چاولێکەریی نابەجێ و بەکارهێنانی زمانی کەسانی تردا قەتیس ماون. ئەم لاساییە کوێرانەیە کە بریتی بوو لە ڕووخاندنی بیری میللی و ڕۆحی میللی، زیانەکانی زۆر لە سوودەکانی زیاتر بوون. لەکاتێکدا لە ئەنجامی کاولکارییە یەك لەدوای یەکەکان بنیاتی میللی خوێنی لەبەر ڕۆیشتووە، نەخۆشیی ڕاستەقینە نەزانراوە و ڕێگاکانی تیمارکردن دەستنیشان نەکراون و بە

چارەسەرە هەڵەکانیش حەشاماتەکان ئیفلیج کراون. ئەم ئاریشانەی کە چەند سەدەیەکیان خایاند، هێشتا لەمرۆشماندا کاریگەریی خۆیان هەیە.

لەم ڕووەوە ئەگەر ئەمرۆش وەك دوێنێ لەسەر هۆکاری ڕاستەقینەی کێشەکان نەوەستین و چەشنی پزیشکێکی بلیمەت دەست بۆ دەردە شەخسی و خێزانی و کۆمەڵایەتییەکانمان نەبەین و لەو زەلکاوی خراپکارییانە دەرنەچین کە چەند سەدەیەکە تێیدا پەلەقاژەمانە، ئەوا کاتێك بەدوای چارەدا دەگەڕێین لەم هەڵە دەکەوینە ئەو هەڵە و ئەوەندەی تر ئاریشەکانمان قووڵتر دەکەینەوە و هەرگیز ناتوانین ڕزگارمان ببێت لەم بازنە شوومەی قەیرانەکان.

باوەڕی تەواومان هەیە بەوەی -ئیدی با ئەوانەی دەسەڵاتدارن و ڕەشۆیان بەدەستەوەیە، لەسەر کەللەڕەقیی چەندین سەدەیی خۆیان هەر بەردەوام بن- ئەو نەوە نموونەییانەی کە بە هەست و بیر و بزاوتنیان ڕوویان لە داهاتوو کردووە و، عاشقانە ئامانج و وڵات و مرۆڤی خۆیان خۆشدەوێت و، بەستراون بە خزمەتەوە و، چەشنی کەوانی ڕاکێشراو هەمیشە لە ئامادەباشیدان، ئەمانە هەموو ئەو دۆخە ناخۆشانە تێدەپەڕێنن و پێکهاتەی نوێ دەخوڵقێنن. بێگومان ڕۆژێك دێت ئەو ئەوینی خزمەتەی لەناو ئەواندایە، دەڕژێتە ناو هەموو چین و توێژەکانی ئەو کۆمەڵگایەوە کە تێیدا دەژین و بگەن بە هەر جێگایەك وەك مێرگێکی ئاوەدان دەیرازێننەوە.. بەڵێ، ئەم بیرەی کە ڕیالیزمی ماددە و جیسمانییەت هەڵدەگرێت و تووڕی دەداتە لاوە، بێگومان بەگوێرەی جیهانبینیی خۆی و پڕۆژەی بزاوتنی خۆی، جارێکی تر و سەرلەنوێ، نەخشی ڕۆحی خۆی دەنەخشێنێت.

# تا جێگایەك جەبرییەت[1]

بەختەوەری و سەربەرزیی نەوەکانی سبەینێ بەرهەمی ڕۆحە فیداکارەکانی ئەمڕۆ دەبێت. چاوەڕێکردنی دواڕۆژی کامڵ و ڕێکوپێك لەو حەشاماتانەی دەربەدەر و پەرێشانن و خۆیان لە باوەشی حەوانەوە و پاڵدانەوە هاویشتووە، جگە لە خەیاڵێکی خاو چیی تر نییە. ئایندە، لە منداڵدانی ئەمڕۆدا چرۆ دەکات و بە خواردنی شیری مەمکی ئەمڕۆش گۆش دەبێت و پێدەگات. هەروەك بوونی ئەمڕۆمان بە چاك و خراپییەوە شوێنەواری ڕابردووە، داهاتووش وێنەیەکە لە ئەمڕۆ دوای گەشەسەندن و فراوانبوون و گواستنەوەی لە ئاستی کەسییەوە بۆ سەر ئاستی کۆمەڵایەتی. بەڵێ، ژیانی میللیمان بە ڕەنگ و چۆنێتیی تایبەت بە خۆی، وەکو ڕووبارێك وایە کە لە چیا و گردەکانی ڕابردووەوە هەڵدەقوڵێت. کاتێك ئەم ڕووبارە بەرەو داهاتوو دەڕژێت، تایبەتمەندیی

---

١. لێرەدا جەبرییەتمان لە بەرامبەر وشەی (المعینیە)ی زمانی عەرەبی داناوە. وەك لە ناونیشانی وتارەکەشەوە دەردەکەوێت، مەبەستی نووسەر جەبرییەتێکی ڕێژەیییە نەك ڕەها، ئەو جەبرییەتەی کە لە سەرانسەری گەردووندا و لە شێوەی یاسا سروشتییەکاندا خۆی دەردەخات و بەشێکی دیاریکراوی ژیانی مرۆیی و مێژووەکەشی دەگرێتەوە. ئەگینا بەدڵنیاییەوە مەبەست لەو جەبرییەتە ڕەهایە نییە کە هەریەك لە ڕێبازی جەبرییەت و دیالێکتیکی ماتەریالیستی لە کۆمیونیزمدا بانگەشەی بۆ دەکەن.

ئەو جێگایانەش لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرێت کە پێیاندا تێدەپەڕێت. ئەگەر بەوردی بڕوانین، لەم تەوژم و شەپۆلەدا کە ئێمەش لەناویداین و ڕاپێچمان دەکات، شوێن پێی باپیرانمان و تربەی ڕۆحیان و بەرهەمی مێشك و بازوویان و ئامانجی باڵا و خەونەکانیان دەبینین. لەم ڕووەوە دەتوانین ئەوان بە سەرچاوەی ژیانمان و پاڵنەرە مێژووییەکانمان و ئێمەش، بە هەوێنی بوونی نەوەکانی ئایندە ئەژماربکەین.

ئەگەر توانیمان لەم نهێنیی میراتگرییە تێبگەین، ئەوا هەرچەند دنیا بە هەموو لایەنێکییەوە پیربببێت و زەمانە بەتەواوەتی بگۆڕێت و چەرخەکان ئاڵوگۆڕیان بەسەردا بێت و هاتووان بڕۆن و ڕۆیشتووانیش هاتووی تر بەشوێنیاندا بێت، هێشتا ڕۆحی میللەت تا هەتایە بە گەنجیی دەمێنێتەوە. چونکە ئەگەر گۆڕانەکان بەم ئاڕاستەیەدا ڕووبدەن و "ئەبوبەکر" بگۆڕێت بە "عومەری کوڕی عەبدولعەزیز" و "عومەر" بگۆڕێت بە "فاتیح" و "عەلی" ببێت بە "ڕۆحی بەتتاڵ غازی" و شێرەکانی بەدر جارێکی تر ناوەرۆك و مانایان لە "مەلازگیرد" و "کۆسۆڤا" و "چەناق قەلعە"دا دەربکەوێتەوە، مانای وایە هەموو شتێك خولگەکەی ئەبەدییەتە. بەڕای من سیحری نوێبوونەوە و لاوێتیی هەمیشەییش هەر ئەمەیە.. بەڵێ، پێویستە لەناوچوونی تاکەکانمان، ببێت بە بناغە و هەوێنی بوون و مانەوەمان وەك میللەت و بە زەردەخەنەوە پێشوازی لە ترسناکترینی مەرگەکان بکەین، تا زامنی ئەبەدییەتێك بکەین بە ڕەهەندە دنیایی و دواڕۆژییەکەیەوە. ئەو پاڵەوانانەی سبەینێمان بۆ ئامادە دەکەن و تەنانەت ئەو وێنە خەیاڵییانەش تێدەپەڕێنن کە لە یوتۆپیاکاندا کێشراون، ئەوانەن کە بە باشترین شێوە سوود لە هەموو کاتەکانی تەمەن

وەردەگرن، هەر لەو کاتەوە کە عەقڵمان بە خۆمان دەشکێت هەتا جیهانی ڕەنگاوڕەنگی گەنجێتی کە گونجاوە بۆ باڵگرتن و فڕین، هەر لە دەمی پێگەیشتنەوە کە سەرفرازە بە هێز و ئیرادە و توانا هەتا سەردەمی دامەزران و پێگەیشتن و کامڵیی پیری.. دەیانبینیت وریایانە هەموو هەنگاوێك هەڵدەنێن و ڕۆژەکانی تەمەنیان پڕە لە چالاکی و لە هەموو وێستگەکانی ژیاندا ئامادەی مەرگن و کاتێکیش دەمرن، ڕوویان لە ئەودیوە و لەناو باوەشی عەشقدان.. بەڵێ، ئەم قارەمانە بێ ناوانە و ئەم پەیکەری ڕۆحانەی کە بەپێی خۆیان دەڕۆن، هەمیشە لەپێشەوە ڕادەکەن، بەڵام لەدواوە دەبینرێن، بەدرێژایی نەوەکان وەك "یادێکی جوان" دەژین، بەڵام هەمیشە پێیان باشە دواى مردن لەدوایان بوترێت "لەوێ غەریبێکی بێکەس مردووە."

ئەگەر لە کاتی ئێستادا، کۆمەڵێك مەردی لەم جۆرە پێنەگەیەنین و دەرفەتی ئەوەیان بۆ نەڕەخسێنین کە ئەو دینەمۆیانەی لە سەرەوە باسمان کرد لە خۆیاندا بەرجەستە بکەن و وەرزە جیاوازەکانی تەمەن لەسەر ئەم دینەمۆیانەی ڕۆح و مانا نەچنین، ئەوا هەرگیز لە تواناماندا نییە شتێك پێشکەشی داهاتووی جیهان بکەین و بوونی خۆشمان لە سبەینێدا مسۆگەر بکەین. بەڵێ، ئەگەر کاتی ئێستامان بە بناغەی ئاڵتوونیی کاتی ئایندە ئەژمار بکەین، ئەوا پێویستە حەتمەن هەوڵ بدەین کە هاوڕێ لەگەڵ بەسیرەت و شعوور و ئیدراك و سەبردا بە باشترین شێوە سوودی لێوەربگرین و بۆ کردنەوەشی بەرووی ئایندەدا، لەپاڵ پاراستنی خود و ڕۆحدا، پێویستە ئەو ڕووانەشی کە کراوەیە بەڕووی ڕاڤەکردن و گۆڕاندا بەجۆرێك دەوڵەمەند بکرێت کە داهاتووش لەباوەش بگرێت، هەتا

لە ئەنجامدا ڕۆژانی سبەی دانەبڕێن لە ئەمڕۆ.. گەر ئەو بابەتانەی لە سەرەوە هێنران پشتگوێ بخرێن، ئەنجامێکی لەم جۆرە حەتمی دەبێت، چونکە لە جێگایەکدا کە هۆکارەکان فەرامۆش دەکرێن، چاوەڕێکردنی هاتنەدی ئەو ئەنجامانەی وابەستەی ئەو هۆکارانەن، لە ڕوانگەی ڕۆحی دین و "شەریعەتی سروشتی"یەوە، هەرگیز کارێکی ڕاست نییە. ئەو جەبرییەتەی (Determinism) هەموو کاتێك لە سینەی بووندا دەیبینین، تا ئەندازەیەکی دیاریکراو و بەشێوەیەکی مەرجدار لە ڕووداوە مێژووییەکانیشدا بوونی هەیە. ئەو مرۆڤ و ڕووداوانەی تێپەڕین و بوون بە مێژوو، چەشنی گرێی ژیان، یان تۆوی ناو منداڵدان، یاخود وەك هێلکەی ژێر مریشکان وان سەبارەت بە ئەمڕۆ.. وە بە سەرچاوەی ئەو بناغانە دادەنرێن کە ڕەنگ و شێوە بە ئێستا دەبەخشن. لەمڕۆشماندا، ئەو هۆکارانەی -لە بازنەی هۆکارەکاندا- وەکو تۆو دەپرژێنرێن بە قەدپاڵەکانی مێژوودا، کۆمەڵێك هۆکارن بۆ ئەو ئەنجامانەی سبەینێ کە خاوەنی ڕەهەندی دانایی و ڕەنگی دادپەوەری و ئەدای دامەزراوی و هاوکێشەی ڕاستڕەوین.

مەگەر ئەمە تا ئێستا هەر وا نەهاتووە؟ ئەو ڕۆژە ڕەشانەی بەسەر ڕۆژگارێکدا هاتوون، ئەنجامی خراپکارییەکانی سەردەمی پێش خۆیان نەبوون؟ تۆفان لە هەمان ئەو زەوییەوە نەهاتە دەر کە لە سەر ڕووەکەی سەرگەردانەکان لە حەزرەتی نوح یاخیبوون؟ ئەو زریانانەی لە "ئەحقاف" قەومان، پرۆسەیەکی سەرەوژێرکردن نەبوو بە ئامانجی پاککردنەوەی ئەو جێگایانەی قەومی "عاد" پیسیان کردبوو؟ کردنی "سەدوم و عامورا"[١]

[١]. بریتی بوون لە دوو شاری کەنعانی لە باشووری دەریای مردوو. خوای گەورە لەسەر خراپکارییەکانیان سزای داون و ئێستاش هەندێك لە شوێنەوارەکانیان ماوەتەوە.

بە قوربانی، جگە لە فیدیەی زەوی بۆ ئاسمان چیی تر بوو؟ لە مێژووی نزیکیشدا، ئەو شتەی هیندستانی بەدرێژایی چەندین ساڵ لەژێر پۆستاڵی ئینگلیزدا چەوساندەوە، ئەو باوەڕە چەوتە نەبوو کە لەناو خۆیاندا هەندێکیان هەندێکی تریان بە کۆیلە دەزانی؟ ئایا تێگەیشتنی هەڵە لە دنیا و دووبەرەکی و نەزانیی نەتەوەکانی ئاسیا نەبوو -ئەو نەتەوانەی لەناو خۆیاندا بووبوون بە گورگ بۆ یەکتری- کە لە چاخی کۆندا بە جەنگیزخان و هۆلاکۆ و لە سەردەمی نوێشدا بە کۆمیونیزم و سۆسیالیزم و سەرمایەداری ئەشکەنجە و سزا دران؟ چ پێویست بە ڕوانینی دوور دەکات، لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا،[1] ئەوانەی لە پشتەوە خەنجەریان دا لە دەوڵەتێکی مەزن کە هەر لە ئەفریقاوە هەتا بەڵقان و لەوێشەوە هەتا هەندێك لە وڵاتانی ئاسیا و لە نیشتیمانێکی فراواندا وەکو لایەنێکی هاوسەنگییەکان لە جیهاندا حسابی بۆ دەکرا، ئایا هەموویان چەندین قات سزای ئەو تاوانەیان وەرنەگرت؟ ئایا هاواری نائومێدانەی "قەرتاجە" و ناڵەی ترسناکی مەسیحییە یەکەمینەکان و دەنگی بەرزبووەوەی ستەملێکراوان نەبوو بۆ عەرشی ئیلاهی کە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمای مەزنی تەختی زەوی کرد؟ لێکردنەوە و فڕێدانی پەیکەری لینین و ستالین و هیتلەر و مۆسۆلینییەکان هاوڕێ لەگەڵ تووڕدانی هەست و بیرکردنەوەکانیان وەك ئەوەی شێرپەنجەیەکی پیس بن لە جەستەی مرۆڤایەتیدا، ئایا هۆکاری ئەوەی کە تا ئێستاش لەعنەتیان بۆ دەنێررێت، ئەو ستەم و تاوانە گەورانەیان نییە کە مەلعوونە ستەمکارەکانی پێشین لەچاویاندا بچووکتر دەردەکەون؟..

---

١. نووسەر مەبەستی سەدەی "بیست"ە.

موسڵمانە یەکەمینەکان، بە ستەملێکراوی و مافخوراوییان، دوژمنەکانیان لە ڕق و قینی خۆیاندا خنکاند و بە دادپەروەرییەکەشیان ئاڵاکەیان گەیاندە هەموو گۆشەیەك. بەدر و فەتحی مەککە، فەرمانڕەوایی حەق و دادپەروەری و ئوحودیش سەرکەوتنی ستەملێکراوی و مافخوراوی بوو. هەتا شمشێر لە دەستی دڵدا بوو، سەرکەوتنەکان بەدوای یەکدا هاتن و لەم کاتە پیرۆزەدا تەنانەت مەیدانەکانی ژێرکەوتن دەگۆڕان بە زەمینەی قازانج و دەبوون بە دەنگی پێی سەرکەوتن لە ڕێگاکانی گەیشتن بە ئایندەدا.. بەپێچەوانەشەوە، لەو ڕۆژەوە شمشێر کەوتە دەستی هێز و قوفڵ لە دەمی دڵ درا، ئایا هەموو فەرمانڕەواییەکی ماددی کە بەرگی سەرکەوتنی پۆشیوە، لە ڕۆحەکاندا دۆڕانی بەرهەم نەهێناوە؟ یان ئایا زەمینەکانی قازانجی نەکردووە بە هەرێمی هیجران و حەسرەتەکان؟

بەڵێ، شەڕ لەژێر هەر ناو و نیشانێکدا بێت تەنها شەڕ بەرهەم دەهێنێت، ستەمیش دەگۆڕێت بە زنجیرەی ستەمەکان. ئەوانەی لە دوێنێوە تا ئەمڕۆ فیتنەیان چاندووە، هەمیشە شەڕیان دووریوەتەوە، ئەوانەش ئەمامی خێریان ناشتووە، میوەی خۆشی و بەرەکەتیان خەرمان کردووە. ئەگەر جاروبار و بەشێوەیەکی کاتیش ئەنجامی کارە باش و خراپەکان دواکەوتبن، ئەوا بێگومان لە وەرزی خۆیدا هاتووەتە گۆڕێ و ستەمکارانی بە حەسرەتەوە تلاندووەتەوە و بووە بە هۆی ڕزگاربوون و بەختەوەریش بۆ ستەملێکراوان. لەوانەیە جاری وا هەبێت نێوانی هۆکار و ئەنجام ساڵان یاخود چەندەها سەدە بخایەنێت، وەلێ هەرکە "وادەی دیاریکراو"ی خۆی هات هێندە بە توندی دادەبەزێت کە بۆ بێتاوانەکان

خودی بەهەشت و بۆ تاوانبار و ستەمکارانیش خودی دۆزەخ دەسازێنێت.

دەکرێت هەموو ئەمانە ڕاڤە بکەین لە ڕێگەی ئەو جەبرییەتەی (پەیوەندیی نێوان هۆکار-ئەنجام) کە لە ڕۆحی مێژوودا هەیە، یان ڕاستتر بڵێین بە یارمەتیی ئەو ڕۆحی دادپەروەرییەی کە لە "شەریعەتی سروشتی"دا بوونی هەیە. وە ئەمەش هۆکارێکی گرنگە بۆ دووبارەبوونەوەی مێژوو و ئاڵوگۆڕیی بازنەیی کات. گەرچی چەندین هۆکار هەن لە پشت ڕووداوە مێژوویییەکانەوە، وەلێ خوای خاوەنی توانستی ڕەها هۆکارەکانی کردووە بە پەردەیەك بۆ کاروبارەکانی و دنیای ئێمەشی پێداپۆشیوە. ئەمەش، وەکو سیفەتی ئیرادەی هەندەکی، لوتفێکی پڕ نهێنییە کە بە مرۆڤی بەخشیوە. سەبارەت بە ئێمەش ئارایشێکی پێویست و کەرەستەیەکە بۆ بەجێهێنانی لێپرساوێتییەکانمان.

لەم ڕووەوە دەتوانرێت بوترێت کە هەروەك جاری وا هەیە تەنانەت جووڵەیەکی زۆر بچووك پاش چەندین ساڵ دەبێت بە سەرەتای پێکهاتنێکی زۆر گەورە، بە هەمان جۆر قەناعەتێکی هەڵە و ڕەفتارێکی چەوت، دەگونجێت لە ئەنجامدا بە ئاریشەگەلێگ کۆتایی پێبێت کە بتوانێت چەرخەکان بهەژێنێت.

لەم ڕووەوە، لەو نەخشە هەرە بچووکانەی نەوە بەختەوەرەکانی ئەمڕۆ لەسەر بیرکردنەوە خێردارەکان دەینەخشێنن، دەکرێت چاوەڕوانی هاتنە مەیدانی هۆنین و چنینێکی پیرۆزی وا بکەین کە ئایندەیەکی ڕەنگاوڕەنگ پێکدەهێنێت و سەرنجی سەرجەم مرۆڤایەتیش ڕادەکێشێت.

## فەلسەفەی ژیانمان

بەشێك لە مرۆڤەكان بە بێ بیركردنەوە ژیان دەگوزەرێنن، بەشێكیشیان تەنها بیردەكەنەوە، بەڵام هەرگیز بیركردنەوەكانیان ناكەن بە كرداری ناو ژیان. ئەمە لەحاڵێكدا ڕاستی ئەوەیە كە بیركردنەوەكانمان لە ژیانماندا ڕەنگ بدەنەوە و ژیانیشمان لە ئەنجامی كارلێكەكان بیركردنەوەی نوێ و تازە بخوڵقێنێت و بكرێینەوە بەڕووی چەندین جۆری فیكر و بیركردنەوەی تردا. ئەوانەی بێ بیركردنەوە دەژین، وەك داهۆڵی فەلسەفەی ژیانی كەسانی تر وان. ئەمانە هەردەم لەم چاولێكەری بۆ ئەو لاسایی ڕادەكەن و بێ وچان قاڵب دەگۆڕن و بەدرێژایی تەمەن لە ناوەندی لادانی بیر و هەست و تێكچوونی كەسایەتی و ناسنامە و كوژانەوەی ڕوخسار و ناوەرۆكدا گینگڵ دەخۆن، وەلێ هەرگیز ناتوانن ببن بە خۆیان. لەوانەیە جاروبار ئەو مەزهەرییەتەی دەبارێتە سەر كۆمەڵگا تۆزێكیشی بەر ئەوان بكەوێت، یاخود لێرە و لەوێ سوود لە شنەباكانی تەوافوق وەربگرن -هەرچەندەش وا دەربكەوێت كە لەسەر هەست و بیر و ئیرادەی ئەوان دەنیشێتەوە- بەڵام هەرگیز ناتوانن ڕۆحیان بە فەزیلەت و تایبەتمەندیی

ئیرادییانە ئاسوودە بکەن و باڵی پێبگرن و ڕووەو هەتاهەتایی ئاڕاستەی بکەن. ئەمانە هەمیشە لە ئاوێکی مەنگ دەچن کە زڕ و بێ فەڕە و هەموو ساتێك لە لێواری پیس بوون و بۆن کردندایە. بەجۆرێك نەك هەر نیشانەی ژیانیان پێوە دیار نییە، بەڵکو بە تێپەڕبوونی کات دەگۆڕێن بە چەند لانەیەك بۆ میکرۆبەکان و خانەخوێی ڤایرۆسەکان و هەڕەشە لە چواردەورەکەیان دەکەن.

ئەمانە، بیرکردنەوەیان هێندە کاڵ و بۆچوونیان ئەوەندە ڕووکەشە کە چەشنی منداڵان، هەموو شتێك کە دەیبینن و دەیبیستن لاسایی دەکەنەوە و تاوێك بۆ ئەملا و تاوێك بۆ ئەولا شوێن قەرەباڵغییەکان دەکەون و هیچ کاتێك دەرفەتی ئەوەیان بۆ نارەخسێت گوێیان لە خۆیان بێت و بە بەهاکانی خۆیاندا بچنەوە.. ڕاستتر بڵێین هەرگیز هەست بەوە ناکەن کە خۆشیان خاوەنی هەندێك بەهای تایبەتن. ژیانیان بە بەندایەتیی جەستە و نەفس بەڕێ دەکەن.. هەر هەلێکیان لە ڕابردوودا بۆ سازابێت، یان لە داهاتوودا بێتە ڕێیان، تەنها لە چوارچێوەی تەسکی جیسمانییەتدا سوودی لێوەردەگرن و دڵ و ئیرادە و هەست و شعووریان، کە بریتین لە گەورەترین دیارییەکانی خوای گەورە بۆ مرۆڤایەتی، دەکەن بە ئامرازی بێنرخ بۆ چێژە جەستەییەکانیان و تەمەنیان لە ژیانێکی ئاژەڵ ئاسادا دەگوزەرێنن. پلەوپایە و ناوبانگ و بەرژەوەندی و حەزی ژیان و حەوانەوە، دیارترین پاڵنەرەکانی جووڵە و چالاکییەکانیانن. بە خۆیان بزانن یان نا، هەموو ڕۆژێك خۆیان لەناو تۆڕی بکوژی دانەیەك یان چەند دانەیەك لەمانەدا دەبیننەوە و ڕۆحیان چەندین جار بە ڕسواترینی مەرگەکان دەکوژن.

ئەم جۆرە كەسانە نە ڕابردوویان هەیە نە داهاتوو، وەكو عومەری خیام، ئەمانیش دەڵێن "ڕابردوو-داهاتوو گشتی ئەفسانەیە.. ڕابوێرە و ژیانی خۆت مەشێوێنە." شوێن هەستە ئاژەڵییەكانیان دەكەون و دنیا وەك سەیرانگا و مێرگێك دەبینن و هەمیشە دوور لە هەستە مرۆیی و مەلەكە مرۆییەكان دەژین. ڕاستتر وایە بڵێین، هەردەم لە زەلكاوی خراپكارییەكاندا ڕۆدەچن و پەلەقاژە دەكەن.

هەرچی ئەوانەشە كە لەگەڵ ژیاندا بیردەكەنەوە و بەگوێرەی ئاست و پلەكانیان، هەموو ڕۆژێك و كاتژمێرێكی ژیانیان دەكەن بە چەند مینا و بەندەرێك بۆ كرانەوە بەڕووی بیركردنەوە نوێیەكاندا، ئەوان هەردەم تەمەنیان لە دەراسایی و سیحر و پەرجوویەكی سەروو كاتدا بەسەردەبەن و وەك كانیاوێكی پیرۆز قوم لە ڕابردوو دەدەن و وەك بۆنێكی خۆش سینەیانی لێ پڕدەكەن و چەشنی پەڕاوێك موتاڵای دەكەن و لەگەڵ ئەم پڕچەكبوونەدا بەرەو داهاتوو هەنگاو دەنێن.. هاوڕێ لەگەڵ گەرمیی ناو دڵیاندا باوەش بە ئایندەدا دەكەن و بە هیواكانیان ڕەنگاوڕەنگی دەكەن و بە هەوڵ و ئیرادەكەشیان شكڵ و شێوەی پێدەبەخشن.. ئەم حاڵی حازرەش كە تێیدا دەژین، وەك چەقی ستراتیژێك بۆ هێنانەدی ئامانجە باڵاكانیان و وەك كارگەیەك بۆ دروستكردنی ئەو تەكنەلۆجیایەی كە لەم پێناوەدا پێویستیان دەبێت و وەك پردێكی پەڕینەوە لەنێوان نەزەری و كرداردا، دەبینن و هەمیشە تێدەكۆشن لە سەروو كات و شوێنەوە بژین.

بەڵێ ئەوان، لە لایەك لەم ڕوانگەیەوە بوون و كات هەڵدەسەنگێنن و سوودی لێوەردەگرن، لە لایەكی تریشەوە بە ڕزگاربوون لە قەفەسەكانی ژیانی ماددی و جەستەیی، بەڕووی جیهانی فراوانی هەست و بیردا

دەکرێنەوە و هەر لەم ژیانە فانی و کاتییەدا، ئەوان بە بنارە نەمرەکانی جیهانێکی تردا دێن و دەچن. هەم بە بیر و هەم بە هەست و هەم بە هیواکانیان هەمیشە موشتاقی هەتاهەتایین و لەگەڵ هەستی ئەبەدییەتدا دەژین و لە فراوانیی ئەو لەددونییەتەدا کە لە قووڵایی دڵیاندا هەڵیانکۆڵیوە، تەماشای دەوڵەمەندیی مرۆڤبوون دەکەن و بە یارمەتیی ئەو تۆڕەی لە دڵیاندا هەڵیانداوە، هەوڵی ڕاوکردنی شتانی وا نائاسایی دەدەن کە چاو نەیبینیوە و گوێ نەیبیستووە و بە خەیاڵی کەسیشدا نەهاتووە. بەجۆرێك، ئیدی زانست و زانیاری و مەعریفەتە ئاست بەرزەکانیان، هەردەم بەرزییەکان و بەرزییەکانی دوای بەرزییەکانیان نیشان دەدات و پەیمانی ئەوەیان دەداتێ هەریەکەیان بکات بە هەڵۆیەکی ئاسمانی. ئەمانەی کە بەم شێوەیە بیردەکەنەوە و بەم جۆرە دەژین، ژیانیان کردووە بە شەتڵگەی بیر، ئەگەر پێتان خۆش بێت دەتوانن ناویان بنێن "پاڵەوانی حیکمەت"، یان "قارەمانی فەلسەفەیەکی ڕازاوە بە هیدایەت".. چۆن پێتان خۆشە ناویان بنێن، بەڵام لەسەر ئەو هێڵەی لە دنیای کۆنەوە تا هەنووکە درێژدەبێتەوە، ئەو مرۆڤە ڕووناکانەی کە مێژوویان چەشنی ئاسکی و وردی و جوانی نەخشێك چنیوە، هەمیشە لەناو ئەم ڕۆحە مەزنانەدا دەرکەوتوون. تەنانەت براهمانیزم و بودیزم و کۆنفشیوسیزم و تاویزم و زەردەشتی کە زیاتر لە سیستەمێکی فەلسەفی دەچن وەك لە دین، بەرهەمی ئەم قارەمانی ڕۆحانەن بۆ مرۆڤایەتی.

لە هاژەی شەپۆلی دووروودرێژی ڕابردوودا، هەمیشە بەستەی ئەم نموونە باڵایانەی هزر دەبیسترێت. جیهانبینییە جیاوازەکان و شێوازە جۆراوجۆرەکانی ژیان و حەوزی شارستانێتیی گەردوونی و دەوڵەمەندییە

کلتوورییەکان لە دنیای کۆن و نوێدا و لە هەر چوار لای جیهاندا، هەمیشە بەرهەمی خەرمانی بیرکردنەوەی ئەم پاڵەوانانە بوون. دەتوانین بەئاسانی بڵێین کە بەشێکی زۆری دانیشتووانی زەوی - هەرچەندە شێوەی ژیانی ئەمڕۆیان زۆریش یەکناگرێتەوە لەگەڵیدا- هێشتا شوێنکەوتەی ئەو ڕۆح و مانا و ناوەرۆکە کۆنەن کە قارەمانەکان وەکو سیستەمێك پێشکەشیان کردوون، سەرەڕای ئەو هەموو گۆڕان و دەستکارییەی بەسەر ئەو سیستەمانەدا هاتوون و دوورخراونەتەوە لە ناوەرۆکی خۆیان.. مادەم سەرچاوەی ئەم سیستەمانە ئەو نمایندە قارەمانانەن کە باسمان کردن، ئەوا تا ئەو کاتەی ئەو دینە پیرۆزە دەدۆزنەوە کە گۆڕان و دەستکاری بەسەردا نەهاتووە، بەردەوامیی شوێنکەوتووانیان لەسەر ئەو هەڵەیەی کە گومانی باش بەم قارەمان و بەم سیستەمانە دەبەن و ڕاڤەی باشیان بۆ دەکەن، پێم وایە دەبێت ئێمە بە شتێکی سروشتی وەریبگرین...

لەم ڕووەوە ئەوەی ئەمڕۆ دەکەوێتە سەر شانی ئێمە -لەکاتێکدا خۆمان بۆ نوێبوونەوەیەك ئامادە دەکەین کە پەیوەندییەکی توندی بە ڕەگەکانی مەعنامانەوە هەیە- ئەوەیە کە پاڵەوانانێك پێبگەیەنین بزانن چۆن خۆیان بکوتن بە هەمان ئەو دەرمانەی لە ڕۆحی خۆیانەوە دەریدەهێنن، واتە هەمان ئەو شتانەی دوێنێ دەمانوت، بێ گوێدانە هیچ بەربەستێك ڕاڤەی نوێی بۆ دەکەن و دەیهێننەوە سەر زمان و هەرجارە و بە یارمەتیی ڕەنگێکی نوێ هەیەجانی خۆیان دەگەیەنن بە دڵەکانمان. لەڕاستیدا هەتا ئەو کاتەی ئەوان پێنەگەیەنین، لە دەستی شاگردە نادانە نامۆکاندا بەم جۆرەی ئێستا لەناودەچین. بێگومان لەم نێوەندەشدا سەرجەمی مرۆڤایەتی، ئەو بەها ئەزەلی و گەردوونییانەی کە بە ویژدان

بەدوایاندا وێڵە و بە عەقڵ هەرچەند دەکات نایاندۆزێتەوە، هەوڵ دەدات شوێنی ئەمانە بە ئەفسانە کۆنەکانی خۆی پڕبکاتەوە و لەم نادڵنیایی بۆ ئەو قەیران و لەم ئاریشە بۆ ئەو کاولکاری مل دەنێت.

چەندین سەدەیە کە نەبوونی فەلسەفەی ژیانی تایبەت بە خۆمان و سیستەمێکی بیرکردنەوە لەناو ئێمەدا کە لەسەر دینەمۆ ئیسلامییەکان وەستابێت -ئەو دینەمۆیانەی ڕەگەکانی مانای ئێمە پێکدەهێنن- وای لە ئێمە و چەندین نەتەوەی تری هاوڕێمان کردووە کە لە ژێردەستەییدا بچەوسێینەوە. پێویستە لێرەدا جیاکاری بکەین لەنێوان سیستەمی بیرکردنەوە و فەلسەفەی "کیندی" و "فارابی" و "ئیبن ڕوشد" و تا ڕادەیەکیش ئیبن سیناکان کە بە وەرگێڕی فەلسەفەی یۆنانی دادەنرێن، لەگەڵ فەلسەفەی ژیان و مەکۆی حیکمەت و سیستەمی بیرکردنەوەماندا کە ڕەگەکانی تا ئاسمانەکان درێژبوونەتەوە و هێندەی ئەزەل کۆن و هێندەش تازەیە کە دەتوانێت هەموو چەرخەکان لەباوەش بگرێت. لە سیستەمی فیکریی ئێمەدا ڕاڤە و تەفسیرێك بوونی هەیە کە لە لاهوت و جەبەروت و مەلەکوت و ناسوتەوە دابەزیوە و کانگاکەی دیار و ڕووناکە و پاڵی بە ڕاستیی بەدیهاتنەوە داوە. ئەمڕۆش تەنها بە تێگەیشتنی تەندروست لەم تەفسیر و ڕاڤەیە دەتوانین سیستەمی هزریی خۆمان بخەینەوە سەر پێ و ئەمە لە هەمان کاتیشدا، دەبێت بە هۆکاری نوێبوونەوەی جددی لەسەر ئاستی جیهان و چەندین ڕێگای دەوڵەمەند دەخاتە سەر پشت.

لە سەردەمی فاتیحی ڕەحمەتییەوە تا ئەمڕۆ زۆر هەوڵدراوە بۆ هێنانە کایەی سیستەمێکی فیکریی لەم جۆرە، بەڵام ئەم کۆششانە هیچ وەخت نەگەیشتوون بە ئامانجی چاوەڕوانکراو. هەرچەندە لەوانەیە ئەم تێبینییە

هەندێك لایەنیشی شایانی مشتومڕ بێت، بەڵام بەگشتی هەر وابووە. زۆركەس هەوڵی دڵسۆزانە یان نادڵسۆزانەیان داوە بۆ وەڵامدانەوەی ئەو گەڕان و چاوەڕوانییەی ویژدانی گشتی هەیبووە، بەڵام هەندێك لە شۆڕشی فەرەنسی و مەجازەكانی "ئۆگست كۆمت"دا خنكاون و تاقمێكیش دڵی خۆیان بە وڕێنەكانی دۆركهایم داوەتەوە.. هەمیشە جووڵەیەك بوونی هەبووە، بەڵام یان حساب بۆ ئەو چەرخە نەكراوە كە تێیدا دەژین، یان تەنها دوای فەنتازیاكان كەوتوون، یاخود هەوا و هەوەس بە هودا لە قەڵەم دراون و سەرشێتانە و سەرسامانە بەها میللییەكانی هەزار ساڵەمان تارومار كراون... خۆزگە هیچ نەبێت ئێستا بمانتوانیایە ئەم لەمپەڕانە تێبپەڕێنین! مەخابن! لافلێدانی ئەوەی گوایە لەم بابەتەدا ڕاست و دروست بیردەكەینەوە، هەرگیز لەگەڵ حەقیقەتدا یەك ناگرێتەوە. ئای چەند حەزم دەكرد هەموو ئەم ناستەنگانە تێبپەڕێنین و سیستەمێكی فیكری و فەلسەفەیەكی میللی پەرەپێبدەین كە بە سەرچاوەكانی خۆمان گۆش بوو بێت!..

پێویستە هەر ئێستا ئەوەش بڵێم لەبەرئەوەی ڕوانین و هەست و بیركردنەوە و گۆشەی تەفسیركردنمان لەیەكتر جیاوازە، ئەگەر سیستەمێكی فەلسەفیی لەم شێوەیە و بەربەستێك و بناغەیەكی فیكریی وامان نەبێت كە هەموو شتێكی لەسەر بنیاتبنێین، ئەوا هەردەم بۆچوونەكانمان دژایەتی یەكتر دەكەن و لە تۆڕی ناسازان و شەڕەشۆڕدا یەكتر دەخۆین و خۆمان لەناودەبەین. بەڵێ، پێویستە لە سایەی سیستەمێكی لەم جۆرە و بناغەیەكی لەم شێوەیەدا كە هەموو نەوەكان بەشدارن تێیدا، ئەمڕۆمان و سبەینێمان ڕەنگ و بۆی ئێمە وەربگرێت. بەپێچەوانەوە ئەگەر لە

هەست و بیر و شێوازی ژیانماندا یەکێتییەکی لەم جۆرە نەبێت، ئەمڕۆ و سبەینێش، دەم کوتینمان لە یەکێتی و یەکگرتوویی میللی، جگە لە ئاواتێکی حەماسی چیی تر نییە. چونکە لە هەموو سیستەمێکدا لۆجیکی میللی و بیری میللی و داوەریی میللی و واریداتەکانی ڕۆح زۆر گرنگن. سیستەمێکی بیرکردنەوە تەنها ئەو کاتە دەتوانێت یەکێتیی هەست و یەکێتیی لۆجیك و یەکێتیی داوەری دابمەزرێنێت و پێکەوەژیان ئاسان بکات کە ئەو سیستەمە لە عەقڵی میللەت خۆی و ویژدانی خۆی و جیهانی هەستەکانی خۆیەوە سەرچاوەی گرتبێت.. ئەگینا لە زەمینەیەکدا کە هەست و بیر و تەفسیر و ئوسلوبەکان تێیدا بەیەکدا دەکێشن و داوەریی ژیرییەکان دژایەتی یەکتر دەکەن، ئەگەر حەرەکەتی زۆریش هەبێت، هەرگیز بەرەکەتی لێ نابێت، نەك هەر بەرەکەتی نابێت، بەڵکو لەم جۆرە حاڵەتانەدا لەناوچوونی تەواوەتییش ئەگەرێکی گەلێك نزیکە. بەڵێ، کۆمەڵگایەك کە ئاریشە و پشێوی تێگەیشتن و ڕاڤەی بەم جۆرە تێدا ڕوویدات، هەر جووڵەیەك، ڕێك وەك ئەو شەپۆلانەی دەریا کە بەیەکدا دەکێشن، دەشکێت و دەڕژێتە حەوزی عەدەمەوە و لە بازنەی خراپکارییەکاندا قەتیس دەمێنێت. لەوانەیە لە شکانی شەپۆلەکانی دەریا لەلایەن یەکترەوە هەندێك حیکمەتی شاراوە بوونیان هەبێت، بەڵام پێکدادانەکانی لەم چەشنە لەناو کۆمەڵگادا تەنها بۆ گەن بوون و داڕووخان و خۆکوشتنیان لێ دەکەوێتەوە. بەجۆرێك لە کۆمەڵگایەکی هاوچەشنی ئەمەدا، وەك بڵێی مرۆڤەکان دەبن بە گورگ لە ئاستی یەکدا و هەموو بیرکردنەوەیەکیش شێوەی پرۆژەی مەرگ لەخۆدەگرێت. خۆ ئەگەر لە ئاسمانەوە هەمیشە ڕەحمەت بەسەر جێگایەکی لەم جۆرەدا ببارێت،

هێشتا ژیانی کۆمەڵایەتی هەر لەژێر هەڕەشەی مۆرانەکردندایە. وە دیسان لە وەها کۆمەڵگایەکدا هەموو کاتێك بەها مێژووییەکان بەشیان کون کون بوون و پیرۆزییەکانیش هەپروون بە هەپروون بوونە.. بەڵێ، لەناو ئەم جۆرە حەشاماتانەدا نە وەفا بەرامبەر بە پیران هەیە و نە هەستی جوامێری لە گەنجاندا. ئەو هێزە چالاکانەی کە بە خەیاڵی خۆمان چاوەڕوانین ئایندە لەسەر شانیان هەڵبگرن، لە لایەك تف لە ئاڵا دەکەن و جوێن بە ڕابردوو دەدەن، لە لایەکی تریش داهاتوو بە مەیدانی سەرشێتی و جەربەزەیی و سەرگەرمییەکان دەبینن بۆ هێنانەدی هەرزەییەکانیان. لە بەرامبەر ئەمەشەوە پیران و ڕۆشنبیران خۆیان لە باوەشی بێباکییەکی ترسناك هاویشتووە و بەجۆرێك ڕەفتار دەکەن وەك ئەوەی هاندەری ئەم خراپکاری و کاولکارییانە بن. بە گوتە و نووسین و کێشانەکانیان و بە پرۆگرامی سەر تەلەفزیۆنەکانیان، هانی لایەنی ئاژەڵێتیی ناو ڕۆحەکان دەدەن و هەردەم تێزاب دەکەن بە چاوی بەسیرەتەکاندا.

لەم سەردەمانەدا چیتر خانەکانی زانست، بیری زانستی و عەشقی زانست لە ڕۆحەکاندا ناچێنن. ئەوانەی نمایندەی هێز دەکەن، دەبن بە داردەستی ئایدۆلۆژیا دیاریکراوەکان و سەری یەکتر دەخۆن.. لۆجیك و داوەریی ژیری و ئیلهامەکان مەحکوم دەکرێن بە ڕۆیشتن بەنێو داڵانی تەسکی هێما و ئاماژەکاندا.. وە بێگومان لە کۆمەڵگایەکی وادا کە چەوتییەکان تێیدا نەشونما دەکەن و هەوا و هەوەس جێگای بیرکردنەوەی دەگرنەوە، ئیدی خودی ژیانیش دەبێت بە ئازار.

ئەمە لەحاڵێکدا کە سیستەمیی فیکری و فەلسەفەی ژیانی ئێمە هەروەك پەیوەندی بە بوون و جیهانی پێش بوون و جیهانی پاش بوونەوە

هەیە و وەکو "گشت"ێك تەماشای بوونەوەر و پەردەی پشتی بوونەوەران دەکات، بەهەمان جۆر خاوەنی فراوانییەکی وایە کە دەتوانێت بەردەوامی ببەخشێت بە شێوازی گشتیی ژیانمان. هەر لە سایەی سیستەمێکی لەم جۆرەدایە کە کۆمەڵگا و ئەندامەکانی ناوی ئەخلاقیبوون دەبێت بە رەوشتێکی جێگیر تیایاندا و ئەو دادپەروەرییە جیهانییەش کە سەر زەوی چاوەڕوانیەتی دێتەدی و وەڵامی ئاوات و خۆزگەکانی مرۆڤایەتی دەدرێتەوە.. وە بەهۆی ئەمەوە کۆمەڵگا بە ڕۆح و ئەخلاق و فەزیلەت و بیرکردنەوە بەخێودەبێت و دەگات بە هێزێك کە وەك خۆی بمێنێتەوە، بەڵام خۆیشی نوێ بکاتەوە.. تا وای لێ دێت بیری شارستانێتی و دەوڵەمەندییەکانی کلتوورمان دەبێت بە کاڵایەکی خواستراو و خۆشویستراو لە هەموو گۆشەیەکی جیهاندا.. وە ئیدی وەك دەستی بەخشەر، دەتوانین ئاسانتر بیری مرۆڤایەتی و فەلسەفەی ئەخلاق و جیهانبینی فەزیلەت و هەستی دادپەروەریی خۆمان پێشکەشی هەموو جیهان بکەین. وە هەر لە سایەی دامەزراوە و ئاستێکی لەم جۆرەدایە کە هەموو سەرچاوەکانی هێزی دەوڵەت و دینەمۆ ئیدارییەکانی و بنەما کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانی، لە ڕۆحی میللەت خۆیەوە هەڵدەقوڵێن و لەم ڕووەوە نەتەوەش لە هەموو جۆرە "ئالوودەیی"یەك ڕزگاری دەبێت. هەتاکو ئێستا، ئەگەر زۆر ڕوون و ئاشکراش نەبووبێت، بەهۆی هەندێك لە خاڵە لاوازەکانمان و قەرزارییەکانمان و ئەو "ئالوودەیی"یەی کە چەشنی زنجیری کۆیلایەتی لە ملمان کردووە، سیستەمی ئیداری و ئابووری و سیاسی و دادپەروەریمانی دووچاری سستی و ئیفلیجی کردووە. باووباپیرمان پێش ئێمە نیشتمانی خۆیان کرد بە ئاوەدانترین هەرێمی سەر

ئەم زەوییە و سیستەمی ئیداری و سیاسی و دەزگای دادپەروەرییان لە کەرەستەکانی ڕۆحی خۆیان بنیات نا. هەرگیز ڕێیان نەدابوو هیچ بیر و سیستەم و تێگەیشتنێك توخنی حەرەمی ئەم دەزگایانەیان بکەوێت، هەتا لە مەحەکی خۆیانی نەدەن و بە پێوەرەکانی خۆیان هەڵینەسەنگێنن.. نەك ڕێیان نەدابوو، دوای ئەوەی کە لەگەڵ هەموو جیهان دەستەویەخە بوونەوە و تووشی ژێرکەوتنێکی کاتی هاتن، بریندار بەڵام ئومێدەوار، لەرزیو بەڵام ئیماندار بوون و تەنانەت کاتێکیش لە گۆشەیەکیش خزان، تا ئەندازەی خۆفیداکردن هەوڵی پاراستنی ژیانی ئەسڵیی خۆیان داوە و هەردەم لە دەوری شعووری مێژوویی گردبوونەتەوە و بە دەربڕینی فەرمووده پیرۆزەکە، بە ددانەکانیان توند ئەو پاڵنەر و هۆکارانەیان گرت کە بوون و ژیانمان وابەستەیە پێیانەوە.. وە هەمیشە سەربەرز و تێگەیشتنیان لە دنیا و دوارۆژ لە شوێنی خۆیدا بوو و لە هەناسەبڕکێدا بوون بەرەو زیندووبوونەوەیەکی نوێ...

لەم ڕۆژانەدا کە گزنگ بەدوای گزنگدا دێت، ئەگەر جارێکی تر و لەڕووی ئاسۆی حیکمەتەوە، بتوانین ئەو دنیایەی تێیدا دەژین بەباشی هەڵیبسەنگێنین و کەڵکی لێوەربگرین، بە باشی بوونەوەر و ڕووداوەکان تەفسیر بکەین، کەرەستە بنەڕەتییەکانی پێکهاتەی ناوەوەی مرۆڤی خۆمان لێزانانە دەستنیشان بکەین و بیبەستینەوە بە ئامانجی باڵای ئەبەدییەتەوە، ئەوا هەمیشە دەتوانین وەك پێشینانمان، بگرە لەوانیش لەپێشتر بین. لەڕاستیدا ئەو نەوە خاوەن بەسیرەتانەی کە دوێنێ و ئەمڕۆ و سبەی پێکەوە و لەسەر یەك ئاست تەماشا دەکەن و هەوڵی پاراستنی دابونەریت و عادەت و پاڵنەرە مێژووییەکانی ئەو کۆمەڵگایە دەدەن کە

تێیدا دەژین و لە بازنەی ڕووبارە دووبارەبووەکانی مێژوودا دەزانن چۆن خۆیان نوێ بکەنەوە، ئایا ئەمانە چ ڕێگرێك لە بەردەمیاندا هەیە تا نەهێڵێت هەمیشە لەپێشەوە بن؟

جارێکی تریش بیرخستنەوە سوودی هەیە، تاکە ئەرکێك کە هەنووکە دەکەوێتە سەر شانمان بریتییە لە ورووژاندنی شعووری مێژوویی لە میللەتدا و، گەیاندنی کاریگەریی ئەو ئازار و ژانەی بەدرێژایی چەندەها سەدە کێشراون و، ئەو بیر و باوەڕەی پارێزگاری لێکراوە و، ئەو کلتوورەی ڕەگی داکوتیوە -هەریەکەیان بە ئەندازەی خۆی- بە ویژدانی نەوەکان. ئەگەر بتوانین لەمەدا سەرکەوتوو بین، ئیدی پاش یەك دوو نەوەی تر، کەس لە دەرەوەی دینەمۆکانی ڕۆح و مانای خۆمان، بیر لە گەڕان بەدوای سەرچاوەی بێگانەدا ناکاتەوە بۆ دامەزراوە جۆراوجۆرەکانی میللەت.

بەڵێ، ئێمە هەموو کەرەستەکانی ژیانی داهاتوومان لە ڕابردووەوە هێناوە. ئەگەر بتوانین ئەمانە لەگەڵ نووری دین و ڕووناکیی زانستدا و لەناو مەنجەڵی کلتووردا تێکەڵاو بکەین، مانای وایە ئیکسیری ئەبەدییەتی خۆمان بەرهەم هێناوە.

## نەوەکانی هیوا

نەوەکانی هیوا لە ئێستادا نوێنەری زانست و ئیمان و ئەخلاق و هونەرن و دەبن بە ئەندازیاری ڕۆحیش بۆ نەوانەی دوای ئێمە دێن. ئەمانە، ئیلهامی پاك و بێگەردی دڵیان کە بە ئەودیو گۆشکراوە، دەڕێژنە سینە موحتاجەکانەوە و پێکهاتنی تەواو نوێ لە هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵگادا دەهێننە مەیدان. لە ڕابردووی نزیکماندا، بێبەشبوونی چەندین نەوەی یەك لەدوای یەك و لەناوچوونیان و تەنانەت سەرشێتی و هەرزەییان، سەرچاوەکەی تا ئەندازەیەکی زۆر نەدۆزینەوەی ئەم نەوانەی هیوا بووە.

لەم سەدانەی دواییدا ئێمە تەنانەت لە ناوەڕاستی سەرکەوتنیشدا یەك لەسەر یەك تامی دۆڕانمان کردووە! لەم سەردەمەی کە تێیدا بووبووین بە گورگ بۆ گیانی یەکتری، قین و نەفرەت و هەڵپەی سیاسیمان بۆ نەوەکانی دوای خۆمان وەك میراتێك جێهێشت. بەڵێ، لەم سەردەمەدا ئەوانەی لەناو کاری سیاسیدا بوون و ئەوانەش کە لە دەرەوەی کایەکە پشتیوانییان لێدەکردن، یان بۆ هێنانە سەرەوەی پێڕ و لایەنگرانی خۆیان

هەموو جۆرە ئامرازێکیان بە حەلاڵ زانی و فێڵ و تەڵەکەی وایان داهێنا کە پێشتر بە خەیاڵی کەسدا نەهاتبوو، یان وایان گومان کرد کە بە گۆڕانی دەسەڵات زۆرێك لە شتەکان دەگۆڕێن و نیشتمان ڕزگاری دەبێت. نە ئەمان و نە ئەوانیش هەرگیز لەوە تێنەگەیشتن کە گەیشتن بە ئامانجی چاوەڕوانکراو تەنها بە شۆڕشێکی وا دەبێت کە خولگەکەی ئیمان و زانست و ئەخلاق و بیرکردنەوە و فەزیلەت بێت. لەبەرئەوەی حاڵی نەبوون، ئەو "گۆڕان" و "نوێبوونەوە"یەی کە ئارەزوو دەکرا، ئەوان تەنها لە چەند گۆڕانکارییەکی بێ مانا و ناوەرۆکی شکڵ و ڕوخساردا بینییانەوە و لەکاتێکدا کە دەبوو سەرقاڵی نۆژەنکردنەوەیەکی مێژوویی مەزن بن، خۆیان بە پینە و بۆیە و میکیاجەوە خەریك کرد. سەرەڕای ئەمەش هەندێکیان، جیهانبینییەکی مەزنی وەك بیری میللییان -چونکە خۆیان نامۆبوون بەرامبەر بە بەها ڕاستەقینە میللییەکان- ڕێك وەك "فاوست"[١]ی نەزان، بەرامبەر بە چەند شتێکی بێنرخ، فرۆشت بە شەیتان.. وە دیسان ئەم جۆرە کەسانە، بەگوێرەی هەلومەرجەکانی ڕۆژگار و لەپێناو هەندێك سوود و بەرژەوەندیی کاتیدا ڕۆژێك بەم شێوە و ڕۆژی دواتر بەو شکڵ خۆیان دەرخست. گاهـ وەك هەوا "تورانیزم"یان هەڵمژی و گاهـ هاواریان بۆ دروشمی "نەتەوە.. گوندنشین.. جووتیار" کرد و جارێك دەمیان لە "ئەرستۆکراسی" کوتی و جارێکی تریش "دیموکراسی"یان کرد بە بنێشتی خۆشی ژێر دانیان و جاری واش هەبوو کەوتنە ئەوینەوە

---

١. فاوست کەسایەتییەکی ئەفسانەییە و ئەدیب و نوسەرێکی زۆر کردوویانە بە پاڵەوانی بەرهەمەکانیان. لە هەموویان بەناوبانگتر ڕۆمانی "فاوست"ی گۆتەی ئەڵمانییە. لەم ڕۆمانەدا فاوست پزیشکێکی بەتەمەنە و هەموو ژیانی بە سەرقاڵبوون بە زانست و زانیارییەوە بەسەربردووە، بەڵام شەیتان هەڵیدەخەڵەتێنێت و لەبەرامبەر بەخشینی چێژە دنیاییەکاندا ئیمانەکەی لێدەکڕێت.

لەگەڵ 'كۆمیونیزم'دا، بەڵام هەرگیز سەركەوتوو نەبوون لە دەربڕینی كەسایەتیی خۆیان. بەتایبەت لەسەر ئاستی ڕۆشنبیرەكانمان -بە خۆیان و ئیشتیها دوور لە پێوانە و تێكەڵ و پێكەڵەكەیانەوە- فەنتازیای فەرەنسا و حەیرانبوون بە ئینگلیز و خۆشویستنی ئەڵمان و لەم دواییانەشدا عەشقی ئەمریكا، بوو بە دینەمۆی تەفسیری ئێمە بۆ ژیان و بەندەری دەرچوونی كەشتییەكانمان بەرەو ئاینده.

ئەمە لەحاڵێكدا پێویستبوو ئێمە وەك ئوممەت خاڵە هاوبەشەكانی وەك ئایین و هەستی نەتەوایەتی، لەسەر كۆمەڵێك بنەما و بناغەی وا پتەو و بەهێز دابنێین كە لەسەروو هەر جۆرە فەنتازیایەكەوە بێت و، پشت بە باوەڕی مەحكەم و بیری ڕەگداكوتاو و ڕەوشتی دامەزراو و فەزیلەتێك -كە بووبێت بەماڵی ڕۆحەكان- ببەستێت. بەڵێ، بزووتنەوەیەكی لەم جۆرە ئەو پەیمانی ڕزگاربوونە دەدات بە نەوەكانی داهاتوو كە چاوەڕێی دەكەین.. بزووتنەوەیەكی ئەخلاقیی وا كە ئاڕاستەكەی نەگۆڕە و كاتێك بەدەوری تەوەرەی ڕۆح و مانای خۆیدا دەسووڕێتەوە، لە هەمان كاتدا ئامادەیە بۆ هەموو كرانەوە و 'گۆڕان'ێك و خولگەكەی ڕەزامەندیی خوایە و بەتوندی داخراوە بەڕووی گەڕان بەدوای سوود و بەرژەوەندییە كەسییەكاندا.. بەپێچەوانەوە ئەگەر دنیای بیركردنەوەمان چەندین زیكزاك بكێشێت و دڵمان هەڵگری باوەڕێكی تێكەڵ و پێكەڵی وابێت كە نەگەیشتووە بە یەقین و مێشكمان چەندین 'میتۆد'ی جۆراوجۆر و چەندەها شێوازی تێگەیشتنی دەربارەی شارستانێتی لەخۆدا هەڵگرتبێت، ئەوا هەرگیز ئەگەری ئەوە لە گۆڕێدا نییە بتوانین خاوەندارێتیی ئەو ڕۆح و مەعنایە بكەین كە كەرەستەی خۆماڵیی میللەتەكەمانە و

پارێزگاری لێبکەین و وەکو سپاردەپارێزێکی ئەمین بیگەیەنین بە نەوەکانی داهاتوو.

لە ڕابردووی نزیکماندا، ئەوانەی شارەزان، باش ئاگاداری ئەو سەردەمە پڕ لە قەیرانانەن کە بەهۆی لەدەستدانی بەها خۆماڵییەکان، یەخەیان پێگرتین. زۆرمان هەوڵدا کە چەندین تێگەیشتنی جیاواز و چەندەها جیهانبینی دوور لە یەك و چەندەها بیری دژ بەیەك لەگەڵ یەکتردا بگونجێنین و لەم ڕێیەوە شێوازێکی نوێ و فەلسەفەیەکی تازە بۆ خۆمان هەڵبهێنجێنین! بەڵام هەیهوو!. چەندین تەمەن بەفیڕۆچوون، کەچی ئێمە هێشتا بە خەیاڵی ئەوەی شتێك دەردەهێنین، دڵنەوایی خۆمان دەکەین. پێم وایە هەروەك هەتا ئەمڕۆ نەمانتوانیوە شێوازێکی نوێ و فەلسەفەی ژیانێکی تازە دابمەزرێنین، لەمە بەدواش بنیاتنانی زۆر سەختە. چونکە هەتا نەبین بە خاوەنی ڕەگەکانی ڕۆح و مەعنای خۆمان، مەحاڵە بگەین بە پێکهاتەیەکی نوێ لە بیرکردنەوە و ئوسلوبێکی تازە بۆ گوزارشتکردن لە خۆمان. نەك هەر ناگەین، بەڵکو هەمیشە هەستمان بە ئازار و ژان کرد لە ڕۆحماندا، وەك ئەوەی لە هەرێمێکی پڕ لە دڕك و داڵدا بین، وەك ئەوەی ناچاربین لە یەك کاتدا هەست بە چەندەها شت بکەین! وە بێگومان لەم نێوەندەشدا، ئەو فرسەتانەی جاروبار دەستمان کەوتن و ئەو هێز و توانایەی وەك ماتەوزەیەك تیاماندا بوو، لە هیچ و خۆڕایی بەزایە بوو.

ئێمە لەم یەك دوو سەدەیەی ڕابردوودا، هەرچەند وادەرکەوتووین کە دەجووڵێین، بەڵام هەرگیز نەمانتوانیوە بەرهەمێکی قەناعەتبەخش پێشکەش بکەین کە خەڵکی ئیرەیی پێ ببەن.. بەرهەمێك کە

نوێنەرایەتیی ئیمانی خۆمان و شێوازی بیرکردنەوەی خۆمان و ڕەوشتی خۆمان و کلتووری خۆمان و هونەری خۆمان و ئابووری خۆمان و شێوازی بەڕێوەبردنی خۆمان، بکات. هەرچەندە لە هەندێك سەردەمدا چەند شتێکی ڕووکەش کراون بە ئاڕاستەی بزواندنی ئارەزووە گەنجانە و فەنتازیاکان، بەڵام لە بابەتی پێداویستییە ڕاستەقینەکانماندا -وەك ڕاڤەکردنی ئەو ڕۆژگارەی تێیدا دەژین، سوود وەرگرتن لە زانست، تێگەیشتن لە بەرژەوەندییەکانی یەکێتی و یەکبوون، سەرکەوتن بەسەر ئەو هەژارییەدا کە ماوەیەکی دووردرێژە زەبوونی کردووە- هەوڵەکان جگە لە دەرزەنێك ئاواتی بێ بنەما، هیچی تر نین. ڕزگاربوونمان لەم بیرە تەسك و بیرکردنەوە چەوتانەی کە دیلیان کردووین و کاتمان دەکوژن، تەنها لە ڕێگەی ئەو قارەمانانەی لەددونییەت و بەسیرەتەوە دەبێت کە زانان بەو چەرخەی تێیدا دەژین و عاشقی زانست و حەقیقەتن و ناڕەحەتییە ڕاستەقینەکانی ئەمڕۆ و ئازارە پێشبینیکراوەکانی سبەینێیان وەك قەمبوورێك لەسەر پشتیان هەڵگرتووە و ڕەفتاریان ئاوێنەی ناخیانە و گوفتاریشیان هەناسەی دڵیانە و دەتوانن هەمیشە چاویان لەودیو ئاسۆکان بێت.. کۆمەڵێك قارەمانگەلی لەدونییەت کە ئازارەکانی ئەو نەوانەی دەخوازن بەرزیان بکەنەوە بۆ لوتکەکان لە ناخی خۆیاندا هەست پێدەکەن و لە ڕۆحی خۆیاندا ئایندەی لێڵی ئەوان بە فرمێسك دەشۆنەوە و ئەییوب ئاسا دەگرین و ژانی دوێنێ و ئەمڕۆ و سبەینێی نەوەکان وەك هی خۆیان دەچێژن و چێژەکانیشیان، وەك ئەوەی نیعمەتێك بن و لای خواوە هاتبن، سوپاسگوزارییان لەسەر پێشکەش دەکەن. ئەمانەن کە هێز و ئیلهام لەو مێژووە ڕەنگاوڕەنگە سەدان ساڵەییەمان وەردەگرن و ڕۆحی

بوون بە میللەتێكی بێگەرد و ڕاستەقینە وەك نەفەسێك دەكەن بە گیانماندا و بە ئیمان و ئومێد، بزاوتن و جۆش و خرۆش دەدەن بە لاوانمان و حەوزی بیری میللیمان كە لەمێژە دووچاری وەستان و مەنگی و خەسین بووە، ئەمان چەندین ڕێڕەو و پلوسكی نوێی تێدا دەكەنەوە. ئێمەومانانیش، وەكو میللەت لەم ڕێڕەوانەدا بەپڕتاو بەرەو ئەو پەرستگایە دەڕۆین كە دەمێكە ونمان كردووە و فرمێسكی بەیەك شادبوونەوە دەڕێژین.. دەگەڕێینەوە بۆ لانكەی ئەو خێزانانەی كە هێندەی كۆشكەكانی بەهەشت گەرموگوڕن و لەوێدا ئەو وێنە و سێبەری بەهەشتانە دەبینینەوە كە لەمێژە لێمان ونن. سەرلەنوێ ئەو خوێندنگایانەی خۆمان دەدۆزینەوە كە یاساكانی عەشقی زانست و گەڕانە بەدوای حەقیقەتدا و لە پەنجەرە كراوەكانییەوە بەرووی بووندا دیسان جیهان دەناسینەوە. ئیدی هەموو كەسێكمان زیاتر خۆشدەوێت و دەزانین چۆن هەموو شتێك لەگەڵ كەسانی تردا بەش بكەین و بە یارمەتیی ئەخلاقی ژیانی پڕ لە چلە و ژان، لە تەپۆڵكە زومرووتییەكانی دڵماندا هەمووان لەباوەش دەگرین.. لە بەرامبەر بووندا بە هەستی هونەری دەخرۆشێین، لە پەیوەندییەكانمان لەگەڵ مرۆڤەكاندا بە ناڵە و فرمێسكی ناوەكی و خۆخستنە جێگای بەرامبەر بیردەكەینەوە. بیردەكەینەوە و پاشان تەعبیر لە خۆمان دەكەین.



"زیندووبوونەوەی دوای مەرگ"ی ئێمە وەك میللەت، وابەستەی دەستەیەك قارەمانی وایە بووبن بە گیانی ناو جەستەمان و خوێنی ناو دەمارمان.. دەستەیەك كە لەودیو ئاسۆكانی زانستەوە گەیشتبن بە نوورەكانی حەقیقەت، حەز و ئارەزووە جەستەییەكانی خۆیان لە چوارچێوەی

پێویستیدا کۆنترۆڵ کردبێت، هەمیشە لە ویژدانیاندا سروودی تایبەت بە ئەودیو ببیستن کە بانگیان دەکات بۆ لای خوا، هەردەم بە زمانی بێ دەنگ و بێ پیت و بێ وشەی هەیەجان و هەنسکەکانیان "ئەو" بدرکێنن، لەگەڵ ئەودا هەناسە هەڵبمژن و بیدەنەوە.

لەبەرئەوەی ئەم پاڵەوانانە هەر لە سەرەتاوە خۆیان بۆ بەندایەتیی حەقیقەت ئامادە کردووە، ئەوا هیچ کاتێك نابن بە دیل و خزمەتکاری داواکارییە تێکەڵ و پێکەڵەکانی ناو کۆمەڵگا و هەمیشە بەهۆی هەستکردن بە بەندایەتیی بۆ خوا، لە هەستان و دانیشتنیاندا ڕەچاوی ئەبەدییەت دەکەن و تەمەنیان لەژێر تاوەبارانی ئیلهامدا دەگوزەرێنن و لەگەڵ هەر ئیلهامێکی نوێشدا دەرگای واریداتی تری تازە دەکەنەوە و لەو ڕووەوە کە هەوڵ دەدەن یەك بکەن بە هەزار لە کەسانی تر جیادەبنەوە و هەموو ساتێك لە فەنایەکی جیاوازدا تامی چێژ و لەزەتەکانی بەقا دەکەن.

سەرگوزەشتەی ژیانی ئەم قارەمانانە، لە چوارچێوەی ئیمان و عیرفان و خۆشەویستی و عەشق و زەوقی ڕۆحانیدا تازە دەبێتەوە. سەرمایەیان ئیمان و زانست و پشتیوانیان خوای خاوەن توانستی ڕەها و ڕێگاکەشیان ئەو شاڕێگایەیە کە تا ئێستا هەموو بەندە باشەکانی خوا پێیدا ڕۆیشتوون. بە ڕابەرایەتیی پێغەمبەر (صَلَّىَ اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) و متمانەکردن بە هێزی نەدۆڕاوی دین و عینایەتە نائاساییەکانی خوای گەورە، ملی ڕێی جاویدانی دەگرنە بەر.. وە بەم شێوەیە سەردەمێکی تری ئیلحاد و فەترەت لە شیوە قووڵە ناسروشتییەکانی خۆیدا دەخنکێت و تیادەچێت.

هەروەك لە هیچ سەردەمێکی مێژوودا ئادەمیزاد نەیتوانیوە بەبێ زانست و ئیمان بژی، شارستانێتییەکانیش خاڵی لە پەرستگا و لە پەرستراو نەبوون. ئەگەر جارویار مرۆڤایەتی بەدەستی خۆی تلێربوویێتەوە بۆ ئەو کەندەڵانی بێباوەڕی و دوور لە زانستەی کە ڕۆژگاری تاریك و لێڵ کردووە، ئەوا بەنزیکەیی لە سەرجەم کەوتنەکانیدا، هەمیشە ویژدان هەستی بە پەیوەندیی قووڵی نێوان خۆی و بەدیهێنەر کردووە و بەراورد بە ڕابردوو بۆ ئاستێکی باشتر و جوانتر و مەزنتر بەرزبووەتەوە. لەم ڕووەوە بوون و مانەوەی شارستانێتییەکان بەبێ پەرستگا و پەرستراو و مرۆڤایەتیش دوور لە زانست و ئیمان و مانەوەیان لە بۆشاییدا، تەنها ڕووداوێکی کاتی بووە.. لەمە بەدواش هەر وا دەبێت.. هەتا ئەو کاتەی قیامەتیش بەرپادەبێت و دنیا دەڕووخێت، بیرۆکەی پەرستگا-پەرستراو لە سینەی مرۆڤ ڕیشەکەن ناکرێت و هەرگیز ناتوانرێت ئادەمیزاد بەتەواوەتی لە خوا دابڕێنرێت. چونکە لە بنەڕەتدا ویژدانەکان کراوەن بەڕووی خوادا، تاریك داهاتنی جارویاری ئاسۆکان، ڕێك وەك ڕووداوەکانی خۆر گیران و مانگ گیران، کاتی دەبن و ڕووناکیی دوای تاریکییەکان و هەڵهاتن دوای ئاوابوونەکان دەکەوێت.. وە ڕۆژێك دێت کە زەمانە و ئەوانەش کە لەناو زەمانەدا دەژین، بە فەرمانە جێبەجێکراوەکانی خوا دەچنە سەر ئەو خولگەیەی کە هەر بۆ خۆی دیاری کردووە و نەخشەکانی لەودیوەوە داڕێژراون و بڕیارەکانی پێشتر دراون.

نەوەکانی ئەمڕۆمان بەنزیکەیی لە هەموو جێگایەکدا، بەدوای ناوەڕۆکی خۆی و دنیای ناو ویژدانی و ئەو بەهەشتانەدا دەگەڕێت کە لەدەستی داوە. ڕووتێکردنی لەم شێوەیە و بەم ئاستە، بەسە بۆ دۆزینەوەی

قارەمانەکەی و گەیشتنی بەڕێگای حەق. ئەوە نییە ویژدانەکان ئیدی لە تەوەرەی سروشتیی خۆیاندا جێگیربوون؟ ئەوە نییە لە بوون و شێوە و ڕەنگی هەر شتێکەوە هەست بە بوونی خوا دەکرێت، کاتێك بە پەنجەرەی هەست و گوێ و چاوەکانماندا دەڕژێنە ناخمانەوە؟

جگە لەمەش، ئەو کوفرەی کە ماوەیەکی دوورودرێژ بوونەوەرانی دارنی لەو ڕۆح و مانایەی هەڵیانگرتبوو، هەروەها لەپێناو هەوا و هەوەس و فەنتازیادا بەکاریدەهێنان، یەك لەسەر یەك بە نامەعقوولییەتەکانی خۆی دەدۆڕێت و تەنانەت ڕووی لە پووکانەوە و هەرەس کردووە.. وە لەم نێوەندەدا ئەو ڕۆحانەی بەدوای حەقیقەتی خۆیاندا دەگەڕێن، چوونەتە دۆخی سەرلەنوێ دۆزینەوەی ناوەرۆکی خۆیان. بێگومان لەم حاڵەشدا پەیوەندیمان بەو شتانەی لەگەڵیان ڕاهاتووین وردە وردە کز دەبێت.. وە لە سایەی هەست کردن بە "خاڵی پشت پێبەستن" و "خاڵی یارمەتی وەرگرتن" کە باشترین بەڵگە لەسەر ئەم دووخاڵە ئەو لاوازی و دەستەوسانییەیە کە لە ناخماندایە، گێچی فیترەت شتە دەرەسا و نائاساییەکان پیشان دەدات.. لەم سەروبەندەشدا ئیرادەکانمان لە تەسکیی خۆیان قوتاریان دەبێت و ڕوو لە ویست و داخوازییەکانی بەدیهێنەری ڕەها دەکەن.

هەر لەم ماوەیەدا، ئیمان و خەبات کە بریتین لە گەورەترین دینەمۆی هەموو سەرکەوتنەکان، هێزی لەددوننی دەبەخشن بە ڕۆحی هەموو کەسێك و ئەم هێزی ڕۆحەش باڵ بە ئومێد و ئیرادەی ئەوان دەدەن و بەدبینی و حاڵی پەشۆکاوییان تێکدەشکێنن و بە تێپەڕاندنیان بە پردەکانی "خۆبوون"دا دەیانگەیەنن بە خوا.

بەڵێ، خێراترین و سەلامەتترین و باشترین ڕێگا ئادەمیزاد بگەیەنێت بە حەقیقەت، ئەو ڕێگای ئیمانەیە کە بە زانست و عیرفان پڕچەك بوویێت. لەڕابردوودا ڕۆح، هەمیشە بەم ڕێگایە ئەو سەرکەوتنە سەرسووڕهێنەر و مەزنانەی بەدەستهێناوە. لە هەرنمێکدا کە ئیمانێکی گۆشکراو بە عیرفان بوونی نەبێت، هێز و زۆرداری، جێگای ڕاستی و یاسا دەگرنەوە.. لە وەها زەمینێکدا ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ستەمی هێزدا هەمیشە ئەگەرێکی چاوەڕوانکراوە. بەڵێ، لە هەرنمێکی لەم چەشنەدا زوو زوو دەست بۆ چەك دەبرێت.. هەمیشە پارە قسەی خۆی دەکات.. تەنها جەربەزەیی دەنگی دلێر دەبێت.. وە ڕیاکاری بەجۆرێك دەبێت بە شمەکێکی خواستراو کە لە وەها کەشوهەوایەکدا گەیشتن بە ڕۆحی بوون و تەماشاکردنی ئەودیوی بوون وەك مەحاڵی لێدێت.

ئەمە لەحاڵێکدا کە حەقیقەتی ئێمە بەتوندی وابەستەی ڕۆحی ئەبەدییەتە. لەپێناو تێگەیشتن لەم پەیوەندییە و هەستکردن بەو شتانەی وەك بەڵێنێك پێمان دەدات، پێویستە وەك میللەت، فیداکاری لە زۆر شتدا ئەنجام بدەین. هەتا لە بەختەوەریی شەخسی و خۆشییەکانی دنیا و پلەوپایە و تەنانەت پلەوپایە مەعنەوییەکانیش دەست هەڵنەگرین، ناکرێت باسی وەها پەیوەندییەك بکرێت. تەنها لەحاڵێکدا کە ئەم پەیوەندییە سازبکرێت، دنیای سبەی جیهانێك دەبێت کە تێیدا حەق دەکرێت بە تاجی سەر و ڕێز لە حەقیقەت دەگیرێت و بیرکردنەوە لە هێز و بەرژەوەندییەکان بە عەیبە دادەنرێت.

ئێمە وا بۆ چەندین ساڵ دەچێت کە لامان وایە کەوتووینەتە ڕێ بۆ گەیشتن بە دنیایەکی ڕووناکی لەم شێوەیە.. لامان وایە و بێ ئەوەی

خۆمان سەرقاڵی کەهانەتی دەرکەوتنی نیشانەکانی بکەین لە ئاسۆدا، بێ ئەوەی کاتی خۆمان بە لێکۆڵینەوە ئەفسووناوییەکانی جیهانی پڕ لە نهێنیی زانستی ژمارەکان و ماتماتیکەوە بکوژین، بە ڕابەرایەتیی جێگیرەکانی خوایەتی (الثوابت الألهية) و هەر شتێك گێچی ڕۆحمان بە ڕاست پیشانی بدات، هەوڵ دەدەین سوود لە هەموو شتێك وەربگرین و تێدەکۆشین بە ئیرادەی خۆمان هۆکارەکانی پەیوەندیکردن بە مەشیئەتی خوایی دەستنیشان بکەین و لەپێناو ئەو شێوازە پیرۆزەی ژیانی خۆمان، وەك قارەمانگەلێك کە هەموو ژیان و بوونی خۆیان فیدابکەن، بەرەو مەشیئەتی خوایی هەنگاو دەنێین. هەموو کەسێك، هاوڕێ لەگەڵ بەرپرسیارێتییەکی جددی کەسیدا، پێویستە ئەسپی خۆی تاوبدات و لە پێشی پێشەوە لە هەڵگرانی ئاڵا بێت و بڵێت ''ئەمڕۆ کار لەسەر من وەستاوە، ئەگەر من تا هێزم تێدایە نەیکەم، کەواتە کەسی تریش نایکات!''.. هەمیشە پێویستە بۆ بەرزکردنەوەی ئاڵا ڕابکات، بەڵام بێئەوەی کێبەرکێ لەگەڵ کەس بکات، بەخیلی بە کەس ببات، وە دەبێت دەرفەتی جووڵە و ڕۆیشتنیش بدات بەوانەی دەستە ڕاست و چەپی. زۆرێك لە ئێمە تا ئێستا بەهۆی هەندێك لەو کارانەوە کە کردوومانە، بە زانین یاخود نەزانین، ڕووناکی دڵانی کەسانی ترمان کوژاندەوە و تێزابمان کرد بە چاوی ڕۆحدا. لەم سەردەمە ڕەش و تاریکەدا، زۆربەی زۆرمان نەمانتوانی خۆمان ڕاپسکێنین و نوورەکانی حەقیقەتی ماهییەتمان بێداربکەینەوە و نەگەیشتین بە دینەمۆ مەعنەوییەکانمان کە بە ئاو و هەوا و ڕووناکیی زیندەگیمان ئەژمار دەکرێن. لە ئێستاشدا ئەگەر لەبری ئەوەی وەك شتە لەرزۆکەکان لە دەرەوەی خۆمان بەدوای

پاڵپشتدا بگەڕێین، دەتوانین پاڵ بەو ماتەوزە شاراوەیەی ناو خۆمانەوە بدەین کە پەیوەندی بەودیوەوە هەیە و بەمەش لە گەشتەکەمان بەردەوام بین.

گەیشتنمان بە ئاسۆیەك کە لێوەی بە چاوی ڕۆح تەماشای هەموو شتێك بکەین و بە گوێی ئەو ببیستین و بە دەستی ئەو بگرین و بە داوەرییەکانی ئەو بڕیاربدەین کە کراوەن بەڕووی ئیلهامدا، تەنها بەوە دەبێت سەرلەنوێ چاو بەم ماتەوزەیەدا بخشێنینەوە و تازەی بکەینەوە. لێرەدا دەتوانین وەك "نیازی" کۆتایی بەم وتارەمان بهێنین "تۆ! بۆ گەیشتن بە بوون، پێویستە هەرگیز لە دەرەوەی خۆت بەدوای مەعنا و ڕۆحدا نەگەڕێیت. دەبێت سەرت دابخەیت و گوێ بۆ ویژدانت هەڵدێریت، ماهییەتت وەك وردبینێك بەکاربهێنیت و گەشتی ڕۆیشتن بەرەو هەبوون لە ناخی خۆتەوە دەست پێبکەیت..."

## کاتێك ڕوو لە خۆمان دەکەین

ئەم چەرخە سەبارەت بە ئێمە، ئێستاشی لەگەڵ بێت، بریتی بوو لە چەرخی کێشە یەك لەدوای یەکەکان. بەتایبەت یەکێك لەم کێشانە هەیە کە هێندە قووڵە هەموو ئەوانی ترم لەبیردەباتەوە و نەخۆشییەکی درێژخایەنی وایە کە بەرگریی بەرامبەر بە چارەسەرەکان هەیە و چەند بەرگەی فەرامۆش کردن ناگرێت، ئەوەندەش لەپێشە و خاوەنی ئەولەوییەتە. ئەم کێشە مەزنە، کە بریتییە لە کێشەی فەرامۆشکردنی بەها خۆماڵییەکان لەلایەن نەتەوەکەمان بەگشتی و لاوانمان بەتایبەتی، ئەگەر بە ئەندازەی قووڵیی برینەکە و بێ ئەوەی هیچ کاتێك بەفیڕۆبدرێت، لەلایەن دەستی وەستا و کارامەوە سارێژ نەکرێن، ئەوا لەوانەیە دووچاریی چەندین ئاڵۆزیی تر ببینەوە و لە مەیدانێکدا کە دەبوو بیبەینەوە بە دۆڕاوی دەربچین و لە چاوەڕواننەکراوترین کاتدا کۆمەڵێك کارەساتی نەخوازراو ڕۆژگارمان ڕەش بکەن.

ئەو فەرامۆشی و غەفڵەت و بێباکی و ناشایستەیی و فەنتازیاکانی گۆڕان و پێشکەوتنەی کە دوێنێ وەکو لوویەکی شێرپەنجە لە جەستەی ئوممەتدا سەریانهەڵدا، بەشێوەیەکی زۆر خێرا و سەرسووڕهێنەر بە هەموو

لایەکی لاشەماندا بڵاوبوونەوە و ئێمەیان هێنایە سەر چۆك. بەجۆرێك خەزانی جۆراوجۆری بەسەر تەمەنی گشت چینەکانی کۆمەڵگادا هێنا و ڕەنگی هەمووانی کاڵ کردەوە. بەڵێ، مەگەر خوا بۆ خۆی بزانێت تا ئەمڕۆ چەند جار ئەم نەخۆشییانە ڕایانوەشاندووین و چەند جاریش تامی بەدبەختیی دۆڕانمان نۆشیوە..چەند جار ئەوانمان وەك چارەنووسی ڕەشی خۆمان ئەژمارکرد و ڕەنگمان پەڕی.. چەند جار بەمەبەستی دەربڕینی تووڕەییمان بەرامبەریان -هەرچەندە لەگەڵ ئوسلوبی ڕاستەقینەی ئێمەدا نەدەگونجا- وشەی نەشیاومان بەکارهێناوە، یان لە هەستان و دانیشتنماندا "لا حول..."مان گوتووە و مۆتەکانمان دیسان لە ناخی خۆماندا کوژاندووەتەوە. لەکاتێکدا هەندێکمان لەم گەرداوە خنکێنەرەدا دەتلایەوە، هەندێکی ترمان تەنها بەوەندە دەوەستان حەیای ئەوانە ببەن کە کەوتوونەتە ئەم زەلکاوی گوناهانەوە.

ئەمە لە حاڵێکدا کە لەبری تاوانبارکردنی ئەم جۆرە کەسانە و هاوشێوەکانیان و ئەو ڕێگایەی پێیدا دەڕۆن، دەبوو هاوڕێ لەگەڵ بەڵێنی ژیانی تازە و نوێدا لەباوەشیان بگرین و بەڕێزەوە سڵاو لە جۆش و خرۆشیان بکەین و بە یارمەتیی دۆزینەوەی کۆمەڵێك بەهانە و هۆکاری مەعقول بۆ وریێنە و سەرخۆشییەکانیان، تووڕەیی و توندوتیژیی ناخمان دابمرکێنینەوە و تەنانەت بە ئامانجی سازکردنی زەمینەیەك بۆ دیالۆگ و لەیەك تێگەیشتن، لە هەندێك ڕووەوە لە مافەکانی خۆمان خۆش بووینایە!. ئەوە ڕاستییەکە کە کۆمەڵگای ئێمە بیری زۆر و تێگەیشتنی زۆر و فەلسەفەی زۆری لەخۆدا هەڵگرتووە. لەبەرئەوە کاتێك لە ڕێڕەوی میلليی تایبەت بە خۆماندا هەنگاو دەنێین، لەوانەیە جاروبار ڕێمان

لە شوێنەواری فەرەنسی هەڵبکەوێت و ڕووبەڕووی هزری ئەڵمانی ببینەوە و لووتمان هەڵتەقێت بە لووتی شێوازی بیرکردنەوەی ئینگلیزیدا و لەمڕۆشدا دەبینین بە فەلسەفەی ئازادیی ئەمریکی خومار بووە.. بەڵام لە هەموو بارێکدا پاڵ بە لەمپەڕەکانی سەر ڕێگامانەوە دەنێین.

دەکرێت بوترێت کە لە ئێستادا هەموو ئەم تێگەیشتن و جیهانبینی و فەلسەفانە کاریگەریی نەرێنییان لەسەر کلتووری میللیمان هەیە، بەڵام هەمیشە دەگونجێت فەرهەنگییەکی لەم جۆرە، وەك دەوڵەمەندییەك سوودی لێ ببینرێت. بەڕای من لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە میللەت بەهاکانی خۆی بپارێزێت و لەسەر تەوەرەی خۆی جێگیربووبێت. بەڵام ئەوەی جێگای داخە ئەوانەی کە توانای گۆڕینی ئەم فەرهەنگییەیان هەیە بۆ دەوڵەمەندیی کلتووری، سەرکەوتوو نەبوون لەم کارەیاندا. ئێمە وەك کرێکارێکی نەزان، کاتێك بینیمان ڕێگای گەیشتن بە کانەکانی ئاڵتوون بە بەرد و خۆڵدا تێپەڕدەبێت، یان دڵمان وابەستەی ئەو خاك و خۆڵەی ڕێگا بوو، یاخود وا تێگەیشتین کە هەموو کانەکە بەرد و خاکە و پشتمان لێی هەڵکرد و لە ئەنجامیشدا زللەی بێبەشبوونمان خوارد. بەڵێ، هەتا ئەمڕۆ بووین بە خاوەنی چەندەها سەرچاوەی ڕووناکی، بەڵام لەبری ئەوەی ئەم سەرچاوانە هەریەکەیان وەك هۆکاری ڕووناککردنەوە بەکاربهێنین، زۆربەی جار ئاگر و بڵێسەمان لێ سازکردوون و لەبری ڕووناکبوونەوە خۆمان پێ سووتاندوون.

ئەوەی مایەی سەرسووڕمانە ئەوەیە کە لەناو ئێمەدا هەرکەس ئەلفێکی زانیبێت کەسانی تری بە کەم بینیوە و ئەوەش دوو ئەلفی زانیبێت خۆی لێ بووە بە فەیلەسووف، ئەوانەی نمایندەی هێز بوون، حسابی یەدەکیان بۆ

ژیری و لۆجیك کردووە و، لە سایەی هێز و زەبردا ملی ڕێیان گرتووەتە بەر و، سیاسەتوانان حیزبایەتییان کردووە بە ئامانجی باڵای خۆیان و، هەموو شتێکی تریان کردووە بە قوربانی و، ژیانی ئابووری و سیاسی و کلتووریمان لە تۆڕی بەخیلی و ڕقەبەرایەتی و قبووڵ نەکردنی یەکدا قەتیس ماوە و، نەیتوانیوە بچێتە دەرەوەی بازنەی خراپکاری دوژمنایەتی و دژیەکییەکان. منداڵان لقی زەیتوون و پەڕی باڵندەی دەستیان کە دەبوو یاری پێبکەن، وەك کوتەك کێشا بەسەری یەکتردا و گەنجان بزاوتنی ناوەکییان، لەجیاتی ئەوەی لە ڕێگای نۆژەنکردنەوەی غروری شکاو و شکۆی لەدەستچوومانداا بەکاربهێنن، دژی میللەتانی خۆیان خستیانەگەڕ و زامی گەورەیان لە جەستەی میللەتدا پێکهێنا.

بڵێی هۆکاری هەموو ئەمانە چی بێت؟ بۆچی لەکاتێکدا کە دەتوانین یەکترمان خۆشبوێت نایکەین و بۆچی هەرچی دەکەین ناتوانین دۆستایەتیی هەمیشەیی پێکبهێنین و بۆچی وەك ئوممەتێك ناتوانین بەشداری خۆشی و ناخۆشی و شین و شایی یەکتر بکەین؟ بڵێی بۆ ئێمە هەوڵ و تێکۆشان بە ئامانجی فەتح کردنی دڵەکان، زۆر سەختتر بێت لە خەباتی مەیدانی جەنگەکان؟ یان داخۆ دڵی ئادەمیزاد کە بە بەنرخترین لایەنی دادەنرێت، داخراوە بەڕووی خۆشەویستی و لێبوردەیی و یەکێتی و قبووڵ کردن و بەش کردندا و کراوەیە بەڕووی قین و نەفرەت و توندوتیژی و قبووڵ نەکردن و بیرتەسکیدا؟.. نەخێر، نەخێر! سوێند دەخۆم بەو خوایەی ئەو دڵەی بەدیهێناوە، هەرگیز ناگونجێت ئەم لایەنە قووڵ و بەنرخ و دەوڵەمەندەی مرۆڤ داخرابێت بەڕووی فەزیلەتەکان و کرابێتەوە بەڕووی خراپە و تاوانەکاندا!..

فاتیحە مەزنەکانی جیهان، لە یەکەم وێستگەی فەتحەکانەوە دەستیان پێکردووە، کە بریتییە لە دڵان.. بەڵێ، ئەوان دڵانیان بردووەتەوە، پاشان لەم بەندەرانەوە بەرەو هەر چوار لای دنیا کراونەتەوە. ئەگەر پێشتر دڵی خەڵکانی ئەنادۆڵ فەتح نەکرابان "مەلازگیرد" ڕووی نەدەدا.. بەڵێ، ئەگەر خەڵکی هەستیان بە بەڵێنی دڵی -ئەو دڵانەی کە بە دڵسۆزی و خۆشەویستی لێیان دەدا- ئەو جوامێرانە نەکردایە کە ئابلۆوقەی "قوستەنتینییە"یان دابوو، هەرگیز گرمەی تۆپەکان نەیدەتوانی بیزەنتییەکان بە چۆکدا بهێنێت.. بەڵێ، هەر ئەو تۆڕی شەفەقەت و خۆشەویستییەی ناو ڕۆحی ئیمانداران بوو کە دڵی هەموو لایەکی سەرمەست دەکرد و دەیخستنە ژێر کاریگەریی خۆیەوە. هەربۆیە دەگەیشتن بە هەر جێگایەك، خەڵکی بەرەو لایان ڕایدەکرد و کاتێك ئەمانیش دەیانگوشین بە سنگیانەوە هەمیشە داستانەکانی خۆشەویستییان بەگوێدا دەدان.

هەنووکە، ئەگەر لە مێژووماندا نەبێت، ئەدی ئەم قین و نەفرەت و دوژمنایەتی و یەکتر قبووڵ نەکردنە، لە کوێوە هاتن و خرانە نێوانمانەوە؟ لەم یەك دوو سەدەیەی دواییدا کاتێك بە چاوی سەرسوورمانەوە تەماشای فەرەنسا و ئەڵمانیا و ئینگلتەرا و ئەمریکا و لەم دواییانەشدا یابان دەکەین، بۆچی ڕقمان لەیەکتر دەبێتەوە و چاڵ بۆ یەکتر هەڵدەکەنین و وەك گورگ لە ئاستی یەکتردا دەژین؟ ڕاستتر بڵێین، بۆچی ژیان لە یەکتر حەرام دەکەین؟ بڵێی لە ئێمەدا نەخۆشیی کەسایەتی هەبێت؟ ئەگەر وا نییە، ئەدی بۆ دەڵێین "ئێمە خێرمان تێدا نییە، هیچ نەبێت با پەنا بۆ ڕۆحە بێگانەکان ببەین." و بەها مێژووییە هەزار ساڵەکانمان لەبەر خاتری هەندێك فەنتازیا، دەبەین و لە زبڵدانی دەهاوین؟

ئیدی با ئێمە هەر لە هیچ و خۆڕایی بەردەوام کێشە و قەیران بۆ خۆمان بنێینەوە... بەڵام لە پشتی ئەمانەوە، مەگەر خوا بۆ خۆی بزانێت چەند نەوەی بێ پشتوپەنا و بێ خولگە و بێ ئامانج و بێ ئاڕاستە و، چەند منداڵی هەوا و هەوەس و فەنتازیاکان پێگەیشت! ئەم نەوەیەی کە هەموو گوڕی میتافیزیکیی خۆی لەدەستداوە و بێناگایە لە وێنەی میللی و ناسنامەی میللی و لە ڕێگای سواڵ و لە چەندین دەوڵەتی جیاوازەوە هەندێك سەرەپارچەی هەندەکی کۆکردووەتەوە و لە وەهمی ئەوەدایە کە بەمانە وەڵامی "من کێم؟"ی دەست کەوتووە، هەمیشە لە تۆڕی ماددەدا گیری خواردووە و بێ دڵ و بێ زمان ژیانی بەڕێکردووە و جاروبار دینەکەی لەگەڵ ئەفسانەکاندا تێکەڵاو کردووە و لە ئاهەنگی پێشوازی لە بێڕەوشتیدا ئەخلاقی کردووە بە قوربانی و ڕەنگی شەهوەتی سویوە لە جیهانبینیی هونەری و شیعر و مۆسیقای خۆی کردووە بە لیکی دەمی لۆتییان، تا لە ئەنجامدا خۆی لە ناوەڕاستی مەیدانێکدا بینییەوە کە تێیدا سەدان جۆر هەڵە لە ململانێدان. خۆ بێگومان چاوەڕێی ئەنجامێکی تری لێنەدەکرا...

ئنجا دواتر ئەم نەوانە، بە ڕقەوە هێرشیان بۆ ڕاست و چەپ برد و سووکایەتییان بە ڕابردووی خۆیان کرد و لەگەڵ ئیمانەکەیاندا متمانەبەخۆبوون و متمانەی کەسانی تریشیان دۆڕاند و لە پاڵ هەستە مرۆییەکاندا، بێبەش بوون لە خۆشەویستیش. جگە لەوەش، لەو سەردەمەدا کاتێك بەتەواوەتی ڕادەستی ویژدانە بێگانەکان کرا، پەروەردەکەشی سپێررا بە دەستە نامۆکان و هەست و بیری وەك منداڵی باخچەی ساوایانی بێگانەکان پێگەیشت و ئەمێستا ئەم فیکرزەدانەی کە لە خۆیان زیاتر لە

کەسانی ترەوە نزیکن، هەرچەندە هێندە لەناو یەکدان کە دەتوانن هەست بە گەرمیی یەکتر بکەن، وەلێ بەهۆی ئەو ساردییەی لەنێوانیاندایە هەردەم هەڵدەلەرزن. هەر ئەمانەن کە ئیمانیان بە هەزار و یەك گومان و دوودڵی کون کون بووە و متمانەیان لە بناغەوە لەرزیوە و هیوایان تارومارە و دڵیان وەك ئەو زەوییە بەراوانەی کە لەمێژە ئاویان لێ کشاوەتەوە وشك و برینگە و هەستە مرۆییەکانیان ئەمانەتی قین و نەفرەت و دوژمنایەتی کراون و سینەی خاڵی و بەتاڵیان جۆلانەی چەندەها ترس و ئەندێشەیە و هەمیشە چنگی بێ ئامانجی و بێ ئاڕاستەیی بەر هەناویان کەوتووە و ئاسۆیان تاریکە و تەنانەت لە لێژاییەکانیشدا هەست بە سەختیی هەورازەکان دەکەن و وەك شتێك کە ناوەرۆك و کاکڵەکەی دەرهێنرابێت و تەنها توێکڵەکەی بەپێوە مابێت، خۆیان و هەموو شتێکیان وەك نیشانەی پەند و عیبرەتی لێهاتووە.

ڕاستییەکەی پێدەچێت گیان کردنەوە بە بەری ئەم تەرمە زیندووانەدا زۆر گران بێت، چونکە ئەوان بەتەواوەتی نامۆ بوون بە ژیانی ئێمەمانان و ڕقیان لە بەهاکانی خۆیان دەبێتەوە. بەڵام هێندە هەیە کە سەرەڕای هەموو شتێکیش، دەست گرتن و بەرزکردنەوەیان هەر دەکەوێتە سەر شانی ئێمە. باوەڕمان وایە ئەو کاتەی مەشیئەتی ئیلاهی بوو بە گیان بۆ ئیرادەکانمان و بەناویاندا ڕۆیشت، ئەم نەوانەش وەك ئەوەی دەنگی کەڕەناکەی حەزرەتی ئیسرافیلیان بیستبێت، ڕادەپەڕن و دەکەونە سەر پێ و بەرەو بوونێکی نوێ هەنگاو هەڵدەنێن. گەرچی پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییانەی کە ئەم پشتگوێخستنە مەزنە لە ماوەی چەندین سەدەدا لە جەستەی نەتەوەدا هێناویەتە بوون و تێپەڕاندنی ئاستەنگەکان زۆر ئاسان

نابن. بەڵام مەگەر خوا بۆ خۆی بزانێت تا ئەمڕۆ چەند جار میراتگرانی سەرزەوی، خۆیان و ستەملێکراو و بەشخوراوانی کۆمەڵگاکانیان لە ژێرکەوتنەوە بەرەو ئاسۆکانی سەرکەوتن سەرخستووە. بێگومان ئەوان ئەم کەندەڵانە ترسناکەش دەبڕن. دەیبڕن و لە دنیای مەحروومییەتی خۆیاندا بەهەشتی فراوان و بەرین بۆ کەسانی تر دەڕازێننەوە.. وە بێگومان بە یارمەتی فراوانیی لێبوردەییان بۆشاییە جۆراوجۆرەکانی ئەو کۆمەڵگایانە پڕدەکەنەوە کە لێپرسراون لە بەخشینەوەی ژیان پێیان.. بە چاویلکەی بچووککەرەوە تەماشای کەموکورتییەکانی کەسانی تر دەکەن و ئەو ویژدانانەیان دەکەن بە دادوەر بەسەر هەڵەی کەسانی ترەوە کە دانی بە هەڵە و ناتەواویی خۆیدا ناوە.. وە چەشنی پزیشکێکی لێزان کە نایەڵێت نەخۆشەکەی هەست بە نەخۆشییەکەی بکات، بێ ئەوەی ڕۆحیان ئازار بدات و دوور لەوەی بیانخاتە ژێر ستەمی هەست کردن بە تاوانەکانیان، چەندین ڕێگای بەدیلی دەربازبوون دەخاتە بەردەستیان.

بێگومان گۆڕینی کەرامەت ئاسایانەی هەموو شتەکانی کۆمەڵگایەك -کە ئەم هەموو ساڵە بەهاکانی ئاوەژوو کرابێتنەوە و ڕاهێنرابێت بە شتە پێچەوانەکان- بە یەك هەڵمەت، کارێکی سادە و ئاسان نابێت! دانانی ئیمان لە شوێنی ئیلحاد و ڕێکوپێکی لە شوێنی هەرەمەکێتی و ڕێسا لەبری فەوزا و ئەخلاق لە جێگای بێڕەوشتی و عەشقی خوایی و خۆشویستنی ئوممەت لە جێی شەهوەت، کارێکی ئاسان نابێت.. ئەو بێباوەڕییەی کە چەندەها ساڵە لە بناری ئیماندا خێوەتی هەڵداوە و ئەو بێباکی و بێخەمییەی بەها ئەخلاقییەکانیان تێکشکاندووە و ئەو بێکەڵکی و بێسوودییەی لە دژی ژیانی پڕ لە یاسا و ڕێسا بەرتیلی

پێدراوە و هارکراوە.. بەڵێ، دەرکردن و ڕیشەکێش کردنی هەموو ئەمانە و دانانی ئەو بەهایانەی خوا دەیەوێت و پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئامۆژگاری کردووین، پێدەچێت کارێکی هەروا ئاسان نەبێت. چونکە بەدرێژایی چەندەها ساڵ، ئێمەش وەك هەموو لایەکی تری دنیا، هەندێك ئایدۆلۆژیای لار و لوێر و بیری هیچگەری (Nihilism) و وڕێنەکانی یاخی بوون، سەرجەم ئەو پێوەرانەیان وێرانکرد کە کۆمەڵگا دەکەن بە کۆمەڵگا، ڕاستتر بڵێین ئەوانەی حەشاماتەکان دەکەن بە کۆمەڵگا.. هەستی بەرپرسیارێتی لە دڵان هەڵکەنرا و فڕێدرا، شەرابی ژیانی ئاژەڵانە دەرخواردی هێزە زیندووەکان درا. لەم سەردەمە ڕەش و تاریکەدا کە هەر ڕۆژە و فەنتازیایەکی نوێ حەشاماتەکانی بەدوی خۆیدا کێش دەکرد، هەندێك خۆیان لە شەپۆلێکی ئەنجام نادیار هاویشت و هەندێك ڕۆحی هاربوو وتیان ''تومەز تا ئێستا بە دەستی بەستراوەوە ژیاوم!''، هەندێك سروشتی شوێنکەوتەی هەوا و ئارەزووەکان وتیان ''ئای خۆ من تا ئێستا بەخۆڕایی شەرمم لە چەندین شتی ئاسایی کردووە، خۆزگە قەت خۆم بەو شتە بێمانایانەوە نەبەستایەتەوە!'' و هەندێك بێبەشیش لە داوەریی ژیری وتیان ''یاخی بووم و لە دیلێتی ڕزگارم بوو!'' یان ''سنوورەکانی حەڵاڵ و حەرامم بڕی و گەیشتم بە ئازادی!''...

ئەمێستا ڕەواندنەوەی ئەم هەموو شپرزەییە و بزواندنی مەنگییەکانمان و بەگەڕخستنی چالاکییەکانمان، لەژێر ڕۆشنایی ئاسۆی بیرکردنەوەماندا، دیسان دەکەوێتە سەر شانی ئێمە و هەموو کەسێکی تر کە وڵاتی خۆی خۆشدەوێت. بەڵێ، پێویستە جارێکی تر ئیرادەمان تا دواین سنوور بەکاربهێنین و بە عەزمێك کە ستەملێکراوی و بەشخوراویی چەندین

ساڵی دووورودرێژ دەمەزەردیان کردووەتەوە، وەکو حەوارییەکان و موسڵمانە یەکەمینەکان، هاودەم لەگەڵ وتنی "لە هەرکوێیەك ئینسان هەبێت، پێویستە ئیمان و شعوور و عیرفانیشی لێبێت"دا تەمەنمان لەم هیجرەت بۆ ئەو هیجرەت بەسەربەرین و دەبێت هەوڵ بدەین نەخشی لەمەودوای ژیانمان لەسەر قەنەواچەی بیر و بزاوتنی ئەو پاڵەوانانەی حەقیقەت بچنین کە گەیشتوون بە ڕەزامەندیی خوایی.

ئێمە باوەڕمان وایە کە ئەمڕۆ بەنزیکەیی هەموو کەسێکی سەر ئەم زەوییە، دەستی یارمەتیدەری ئەم دڵە ئاستبەرزانە ماچ دەکات و دەیخاتە سەر سەری. ئەم ئیرادە دامەزراو و پێگەیشتووانە هەڵگری دین و هەست و بیر و خولیای ئێمە دەبن و وڵات بە وڵات دەگەڕێن و لەم دەرگا و ئەو دەرگا دەدەن و بگەن بە هەر جێگایەك وەك خضر پێشوازییان لێدەکرێت و ئەو فیکرانەش ئەمان پێشکەشی دەکەن، وەك ئاوی حەیات دەخورێنەوە. بەڵێ، ئەوان بە هەر شوێنێك بگەن وەك هاوڕێیەتیی نێوان موسا و خضر چارۆکە لە دەریای ئەبەدییەتدا هەڵدەدەن و بەریەستی پارێزەر بۆ ئەوانە دروستدەکەن کە چاوەڕوانی "زولقەرنەین"ن و ڕێگاکانی گەیشتن بە "زیندووبوونەوەی دوای مردن" پیشانی تەنانەت ئەوانەش دەدەن کە چەندەها سەدەیە لە ئەشکەوتەکاندا بە گۆشەگیری دەژین. کێ دەزانێت، لەوانەیە بە هەر جێگایەکدا تێپەڕببن، یەکەم پزیسکەکانی ئەو ڕێنیسانسە مەزن و گشتگیرەش کە چەندین سەدەیە چاوەڕوانی دەکرێت، هەر ئەوان بیگەیەنن...

# کاتێك
# پەیکەری ڕۆحمان
# بنیات دەنێین

## محمد فەتحوڵڵا گولەن

لەم نوێبوونەوەیەدا زامنی وێڵ نەبوون و ڕێگا ون نەکردن بریتییە لەوەی کە: ڕەزامەندیی خوای گەورە ئامانج و مەبەست بێت و، ڕۆح لەپێش جەستەوە بێت و، نەفس لەژێر بەڕێوەبردنی دڵدا بێت و، خۆشویستنی مرۆڤ و نیشتمان خوویەکی دانەبڕاو بێت لە سروشتمان و، ئەخلاقی بەرز توێشوویەکی گرنگی ڕێگا بێت کە دەستبەرداربوون لێی مەحاڵ بێت و، گەردوون و مرۆڤ و ژیان وەك پەڕاوێکی پڕ لە نهێنی وابن کە هەمیشە لەژێر ڕۆشنایی قورئاندا هەموو گۆشەیەکیان بپشکنرێت و، کاراکتەری مرۆڤ هاوڕێ لەگەڵ بەها ڕاستەقینە مرۆییەکانی سەرچاوەیەکی گرنگی بن و، بە ئەندازەی حەققانییەت و پیرۆزیی ئامانج و مەبەستەکان، دەبێت ئەو ئامڕاز و هۆکارانەش کە دەمانگەیەنن پێیان لە خولگەی قورئان و سوننەتدا بن.







نرخی ۳۰۰۰ دینارە

